پێشکەشە بەدایکم، ئەو (سیزیف)ەی  بێهودەیی بۆساتێك یەخەی بەرنەداو ژیانی لەناو خولەیەکی داخراوی بێ داهاتوودا خنکاند.
بەدایکم، کۆیلەیەکی کەلتووری باوك سالاری.

# ناوەڕۆك

# سوپاس و پێزانین

سوپاسی کاك خالید عەزیزی دەکەم، کە ئەرکی خستنە سەر کەمپیوتەری ئەم دەستنووسەی خستە ئەستۆی خۆی. هەروەها سوپاسی دەستگای سەدەم دەکەم بۆ لە چاپدان و بڵاوکردنەوەی ئەم پەڕتووکە.

# سەرباس

بۆ گەڕان بەشوێن واتای بووندا لە ڕەتدانەوەی نەریتی ئەریستۆ-دێکارتیەوە نەخشەی پڕۆژەکەمان کێشاوە. ئەمەش، وەکو پێویستیەك لە دوو شێوازدا بەئاشکرا خۆی دەردەخات. یەکەم لە ڕەتدانەوەی بیرۆکی سەدەمی هۆشەکیو دانانی بوون بە ناوەڕۆك *Substance*. دووهەم، لە ڕەتدانەوەی پێناسەکردنی بوونی مرۆڤ، وەکو ناوەڕۆکێکی گیانەکیو نەگۆڕ. ئەم دوو خاڵەمان بۆیە کۆکردۆتەوەو پێکەوە ڕیزمان کردوون، چونکە بەردەوامیەك لە بیرکردنەوە فەلسەفیانە لە سەدەمی ئەریستۆوە بۆ دێکارت دیاریدەکات. دێکارت هەوڵیداوە نەریتێکی نوێ بۆ سەدەمەکەی خۆی دابهێنێ، بەڵام هێشتا نەیتوانیوە شۆڕشێك بەسەر نەریتی ئەریستۆدا بەرپا بکاتو بەتەواوی خۆی لە کاریگەری ئەو نەریتە دووربخاتەوە.

ئەریستۆ بوونی بە ناوەڕۆکو کاتیگۆرییەکان داناوە. ناوەڕۆك، وەکو هەڵگری کاتیگۆرییەکان یان بارهەڵگر بەبێ بارەکەی پێناسە ناکرێت. ئەگەر بمانەوێت پرسیارێکی وەکو (ئەوە چیە؟) لە بارەی شتێکەوە

بکەین، لە وەڵامدا دەڵێین ئەوە مێزە. مێز ناوەڕۆکە بەبێ بارەکانی، وەکو چیەتیو چەندەکیو ...هتد هیچی لەبارەوە نازانینو ئەویش نابێت بەبار بۆ ناوەڕۆکێکی دیکە. ئەوەی لە توێژینەوەی ئەریستۆدا سەرنجڕاکێشە ئەویە، ناوەڕۆکە بار هەڵگرەکان (مرۆڤ، ئاژەڵ، ئەستێرە، درەخت، مێز) بنەڕەتێکی هاوبەشیان بۆ دیاری نەکراوەو زۆرتر سەبارەت جیاوازیەکانیان زانیاریمان پێدراوە. گریمان ئەریستۆ دەیەوێت سەدەمی هۆشەکی لە پێشتر بەو بنەڕەتە دابنێت و هەموو ناوەڕۆکەکان بۆ ئەو ناوەڕۆکە لەپێشترە بگەڕێنێتەوە. بەڵام ئەم گەڕانەوەیەش چارەی گرفتەکە ناکات و گرێی مەسەلەکەمان ناکاتەوە. ئێمە ناتوانین سەدەمی هۆشەکی لە پێشتر بەو بنەڕەتە دابنێین، چونکە ئەو سەدەمەش جۆرێکە لە ناوەڕۆك و بارهەڵگر، یان بوونێکە پێویستی بە(بوون)ە بۆ بوونی.

بەم شێوەیە دەبینین مێتافیزیکی ئەریستۆ، بێجگەلەوەی لەئاستی چەند گرفتێکدا توێژینەوەکەمان ڕادەگرێ، چارەی کێشەکەمان ناکات. لەهەولدانەکەماندا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم ڕێگرانەدا سودمان لە ئۆنتۆلۆجی مارتن هایدریگەر وەرگرتوەو لەبەر ڕۆشنایی بیروباوەڕەکانیدا گەشتەکەمان خستۆتەگەڕ. گەڕاوینەتەوە بۆ (بوون)و بەو بنەڕەتە لە بنەڕەت بەدەرەمان داناوە، کە هەموو جیاوازییەکانی لە ناو خۆیدا هەڵگرتووە. لە ڕوونکردنەوەی جیاوازیەکاندا ئاماژەمان بۆ بوونی

مرۆڤو هەبووەکان کردووە. بەدرێژایی توێژینەوەکەمان دەمانەوێ تەفسیرێکی ڕادیکاڵی جیاوازییەکانو تایبەتمەندی بوونی مرۆڤ بکەین.

د. محەمەد کەمال

زانکۆی مێلبۆرن

2003

بەشی یەکەم

# بوون

پرسیاری گەورە وەڵامی گەورەی لەدوایەو بوێرانە لەسەر زەمینێکی فەلسەفی مامەڵە لەگەڵ کێشەکە دەکات. وەڵامی گەورەش بەشیکردنەوەو هەڵسەنگاندن تێگەیشتنمان سەبارەت بەبوونە لێپرسراوەکە بە دوورگە نادیارەکان دەگەیەنێتو بوارەکانی بیرکردنەوە بەربڵاوتر دەکاتەوە. مەبەستمان لەپرسیاری گەورە گەڕانە بەدوای واتای بوونێکی لەپێشتر نەناسراو. پرسیارکردن لەم (نەزانین)ەوە سەرهەڵدەداتو گەشتە فەلسەفیەکەمان بەڕێ دەخات. ئەگەر بوونێك بناسرێت و زانیاری تەواوی لەبارەوە هەبێت پێویست ناکات جارێکی دیکە ئەو بوونە بخرێتە بەر ڕۆشنایی توێژینەوە.

پرسیارکردن هەڵوێستی مرۆڤانەیەو بێجگە لەمرۆڤ بوونەوەرێکی دیکە بەدوای واتای بووندا ڕەبەن و گەڕیدە نیە. ئەمەش ئەوەدەگەیەنێت مرۆڤ لەبەر ئەوەی ئاگامەندەو ئاگامەندیش ناتەواوە، بەنەزانینەوە پەیدا

بووە. ناتەواوی ئاگامەندیش بووە بەسەرچاوەی ویست و ئارەزووەکانی بۆ خۆ تەواوکردنو هاندەرێکە بۆ هەوڵدانێکی ئۆقرەنەگر لەپێناوی تێگەیشتن لەواتای بوون. ئەگەر ئاگامەندی بوونێکی پڕو تەواوی هەبوایە خولیای پرسیارکردنی نەدەکەوتە سەرو لە مزڵگەیەکدا کاروانەکەی دەخستو خۆی ماندوو نەدەکرد. ئەوەی لەمەڕ پرسیاری گەورە دەمانەوێت ڕوونی بکەینەوە چۆنیەتی پرسیارەکەو شێوازی وەڵامەکەیەتی، کە بەفەلسەفیانە ناوزەدمانکرد. لەگەڵ ئەم کێشەیەدا ئەو پرسیارە خۆی دەسەپێنێت؛ ئایا زەمینەی فەلسەفە چیە؟ یان فەلسەفە چیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەندە ئاسان نیەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەی تایبەت هەیە، چونکە زاراوەی (فەلسەفە) کوردی نیەو ڕۆشنبیرانی کورد لە(الفلسفة)ی عەرەبیەوە وەریانگرتوە. عەرەبەکانیش لە(فیلۆسۆفیا)ی یۆنانیەوە ئەو زاراوەیان لە زمانەکەیاندا داتاشیوە. بەهەرحاڵ، نەبوونی زاراوەیەکی تایبەتی بەکوردی بۆ (فیلۆسۆفیا)ئاماژەی هەژاریو دەستکورتی زمانەکەمان ناکاتو هەندێك لەزمانە پێشکەوتوەکانی جیهانیش زاراوە یۆنانیەکەیان بەکارهێناوە.

بۆ ڕوونکرنەوەی واتای فەلسەفە دەگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە یۆنانیەکە، کەبووە بەزانگەی ئەم زاراوەیەو بۆ یەکەمجار لەو زمانەدا بەکار هێنراوە. فەلسەفە لە زمانی یۆنانیدا وشەیەکی لێکداراوەو لە دوو بەش پێکهاتوە؛

*philosophia* . بەشی یەکەمی وشەکە *philo* واتای (خۆشەویستی )و بەشی دووەم *sophia* (زانین)دەبەخشێت. توێژینەوەکەمان لێرەدا جەخت لەسەر واتای بەشی دووەم(زانین)دەکات، کەدیارە واتاکەی ئاشکرا نیەو نازانین چی جۆرە زانینێك خسڵەتی فەلسەفیانە هەڵدەگرێ.

ئەشێ کەسێك هۆکارەکانی جەنگی جیهانی دووەم بزانێت یان یاساکانی فیزیکی (نیۆتن)ی لەبەر بێت، بەڵام ئایا ئەو زانینە فەلسەفیانەیەو ئەوکەسەش بە فەیلەسوف دادەنرێت؟ بێگومان هەموو کەسێك زانیاری هەیەو ئەریستۆ گوتەنی عەشقی فێربوونو زانین لەمێشکیدایە کەچی مەرج نیە هەموو کەسێك بانگەشەی فەیلەسوفی بکات.[1] لەزمانی عەرەبیدا هەندێکجار(الحکمة) بۆ شێوە زانینی فەلسەفی بەکار هاتووە. لە قورئاندا لە چەند سورەتێکدا ئەم زاراوەیە داندراوە؛(هوأحکم الحاکمین.)،(هوالحکم و لە الحکم.) هەروەها ئیبن ئەسیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت؛(في اسماء الله تعالی الحکم و الحکم و هما بمعنی الحاکم، وهو القاضي...)[2] ئەم زاراوەیە لەزمانی عەرەبیدا لە چاوگی (حکم)هاتوەو زۆری وشەی دیکەی وەکو(حاکم، حکیم، حکم، المحکمة،

---

[1] - Aristotle. *Metaphyscs*, (Book A, 980 a)Translated bay Hippocrates G. Apostle Indiane University press, 1966

[2] - بڕوانە: ابن منظور المصري، لسان العرب،دار صادر ، بيروت، 1992. لاپەڕە140.

حکومة) لێوە دەرچووە.[3] لەزمانی کوردیدا، بەتایبەتی لە ئەدەبی کلاسیکیو سۆفیگەریدا (الحکمة) بۆزانینی قوڵو عرفان بەکار هێنراوەو حەکیمی خراوەتە تەك زانایانو پزیشکەکانی وەکو ئەفلاتونو ئەریستۆو لوقمان(لوکمایۆن)[4]و سوهرەوەردی (المقتول)و هتد. لای موسوڵمانەکان حەکیم بە پزیشکیش دراوە. هەڵبەتە بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە لەم بواری زانینەدا بەڕای من دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆکارە، زۆرینەی فەیلەسوفە موسوڵمانەکان وەکو ڕازی، ئیبن سینا، ئیبن توفەیل و ئیبن ڕشد پزیشك بوون. لە ڕوویەکیشەوە پیشەی پزیشکی، وەکو فەیلەسوفی‌یە. پزیشك دەبێت ڕێگەچارەی نەخۆش بدۆزێتەوەو بە زانینە هەمەکیەکەی چارەی نەخۆشیەکە نەك تاکەکەسێك بکات. ئەم ئەنەلۆجیەش(شوبهاندن) دەمانگەڕێنێتەوە بۆ پێناسەکردنی زانینی فەلسەفیانە لای ئەریستۆ. بەدیدی ئەم فەیلەسوفە زانینی فەلسەفی هەمەکی‌یەو (زانینە لەپێناوی زانیندا).[5] زانینی هەمەکی ژور کێشە هەندەکییەکان دەکەوێت و وەکو ڕێگەچارەی نەخۆشیەك بەسەر هەموو ئەوانەدا دەچەسپێت، کە تووشی نەخۆشیەکە بوون.

---

[3]- هەمان سەرچاوە.

[4]- لوقمان (لۆکمایۆن-Alcmaeon) فەیلەسوفێکی یۆنانی پێش سەدەمی (سوکرات)ەو لەسەدەی پێنجەمی پێش زاییندا ژیاوە. لۆکمایۆن، کە لە ئەدەبی کوردیدا بەلوقمانی حەکیم ناسراوە، پزیشکێکی بلیمەتو شاگردی پیتاگۆڕاس(570 پ‌ز-497پ‌ز)بووە.

[5]- Aristotle. op.cit.,A1, 980 a 21

لەزمانی کوردیدا زاراوەی (زانا)و(دانا) بۆ حەکیم بەکاردێتو دەخرێنە پاڵ کەسێکی لێزان، بەڵام دژوارە زاراوەی (زانا) بۆ فەیلەسوف و (زانایی) بۆ فەلسەفە دابنێین، چونکە کەسێکی زانا(لێزان) مەرج نیە فەیلەسوف و زانایيەکەشی فەلسەفیانە بێت. لەبەر ئەمە زاراوەی (فەلسەفە)، کە لە زمانی عەرەبیەوە وەرگیراوەو لەبنەڕەتیشدا یۆنانیە، وەکو خۆی بەکار دەهێنمەوە.

زانینی فەلسەفیانە خۆی لەقەرەی پرسیارەگەورەکان دەدات و هەوڵدەدات لۆجیکمەندانە وەڵامەکان ئامادە بکات و(حوکم) بەسەر کێشەکاندا بدات. لێرەدا بەبیرو ڕای هەندێك، حوکمدان بەسەر کێشەدا تووشی دۆگمای بیرکردنەوەمان دەکات. ئەم بیروڕایە دروستەو نکۆڵی لەوەش ناکرێت، کە دۆگما بوارەکانی بیرکردنەوە تەسك دەکاتەوە. بەڵام بەبێ حوکمدان وەڵامیش پەیدا نابێت و هەموو وەڵامدانەوەیەك لە خۆیدا دۆگمایە. لە پرۆپۆزیشنی(گۆچان خوارە) حوکم بەسەر ئەو ڕاستیەدا دەدەین ، کە گۆچان وەك بابەتێکی خوار دادەنێ. هەموو باسێك بەم جۆرە حوکمدانە بە سەر کێشەیەکداو دۆگمایە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەم دۆگمایە دوا دۆگمایەو زانینی نوێتر لەبارەی کێشەکەوە پەیدا ناکرێت. دۆگمای فەلسەفی بەپێچەوانەی دۆگمای(بڕوا)وە دەرگا لەسەر بۆچوونەکانی داهاتوو داناخات و خسڵەتی هەمیشەبوویی بەخۆی نادات. کاتێك لە

ئەریستۆیان پرسی بۆچی دژی بیروباوەڕی ئەفلاتونی مامۆستای ڕادەوەستێت، لە وەڵامدا گووتی: (ڕاستی) لە لای من لە ئەفلاتونی مامۆستام پیرۆزترە. ئەمە نموونەی دۆگمای فەلسەفیانەیە، کە بێ ئارام بەرەو ترۆپکی تێگەیشتن لەواتای بوون ڕەوتدەکات و ئەو ترۆپکەش بۆ ترۆپکێکی دیکە دەبێت بە ڕوانگەیەکی نوێ. لەم ڕووەوە بۆچوونەکەمان لە کارتێکردنی گومانکاری دەپارێزین و نامانەوێت بناخەی توێژینەوەکەمان بخەینە سەر زەوییەکی لێژو نەرم.[6] گومانکاری، کە جەنگێکی نەبڕاوەی دژی دامەزراندنی زانین خستۆتەگەڕ، ناکۆکیەکی لەچارە بەدەری لەناو خۆیدا ڕاگرتووە. بۆ ئەوەی خۆی تووشی دۆگما نەکات پەنای بردۆتە بەر ئەو دۆگمایەی باوەڕی بە دۆگمانیەو ئەو خاڵەی لەبیر کردووە، کە ڕەتدانەوەی دۆگما حوکمدانە بەسەر نەبوونی دۆگمادا یان حوکمدانە بەسەر نەبوونی حوکمداندا. لەم بۆچوونەی ئێمەوە دۆگماو ڕەتدانەوەی دۆگما، باوەڕهێنان و باوەڕنەهێنان هەردوو وەکو یەك هاوتاو دۆگمان.

[6]- مەبەست لە گومانکاری، فێرگەی فێرو نیە، کە فێرۆ Pyrrho(360-275 پ ز)و شاگردەکەی تێمون Timon(315-225 پ.ز) دایانمەزراندو کاریانکردە سەر شێوەی بیرکردنەوەی فەلسەفیانەی فێرگەی ئەسکەندەرییە لەمیسر. گۆمانکاری لەو باوەڕەدایە، کە نابێت باسی شتێك بکرێت کە لەودیو دەسەڵاتەکانی هەستکردنەوەیە. گومان لە بوونی هەموو شتێکی نا-هەستەکی و هۆشەکی دەکات.

زاراوەی فەلسەفە لە لای یۆنانیەکان بۆ یەکەمجار هۆمیرۆسی شاعیر، کە لەسەدەی حەوتەمی پێش زایندا ژیاوەو هێرۆدۆتسی مێژوونوس (420 پ.ز مردووە) بەکاریانهێناوە. هێرۆدۆتس لە پەڕتووکەکەیدا لەسەر مێژوو ئەم زاراوەیەی بە(فرمان) نەك ناو یان ئاوڵناوە داناوەو بە بۆچوونی ئەو(فەلسەفەکردن) گەڕانە بەشوێن دۆزینەوەی شتێکدا.[7] هەرچەندە فەلسەفە لەم پێناسەیەدا بە پڕۆسە دانراوە بەڵام هێشتا دیار نیە ئەو پڕۆسەیە لە پێناوی دۆزینەوەی چیدایە. ئایا دەگونجێت کەسێك بەشوێن سامانێکی وونبوودا بگەڕێت بەفەیلەسوف دابنرێت؟ پێناسەکەی هێرۆدۆتس لەسەر دەستی پیتاگۆراس و شاگردەکانی تەواوکراو ئەو گەڕانە لای ئەم فەیلەسوفانە بوو بە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی خۆڕسك یان ناوەڕۆکی شتەکانی دەوروبەرمان. بۆ نموونە گەڕان بە شوێن سامانێکی وونبوودا کارێکی فەلسەفیانە نیە بەڵام دۆزینەوەی واتای(سامان) یان ناوەڕۆکی (سامان) کێشەیەکی فەلسەفیانەیە.

ئەریستۆ پێناسەیەکی نزیکتری لەمەبەستی تویژینەوەکەی ئێمە بۆ فەلسەفە ئامادە کردوە و فەلسەفەی بەو زانستە داناوە لە واتای (بوون) Being *qua* Being دەکۆڵێتەوە.

[7] Herodotus. *History of the Greco-Persian war*, London: Bell, 1875. P. 30 -

"زانستێك هەیە، بابەتی باسەكەی (بوون)ە. ئەم زانستە وەكو زانستەكانی دیكە نیە؛ چونكە ئەوان خۆیان بە بوونی هەمەكیەوە خەریك نەكردووە. هەریەكێك لەو زانستانە لە لایەنێكی بوون دەكۆڵنەوە."[8]

لێرەدا باسی دووجۆر زانست كراوەو جیاوازییان بە چۆنیەتی بابەتی یەكەم بوونە گشتی‌یەكەو دووەمیان بەشێكی ئەم بوونەیە.

ئەو زانستەی لە بوونی گشتی دەكۆڵێتەوە، بە بیرو ڕای ئەریستۆ فەلسەفیانەیەو جیاوازی ناوەڕۆكیی لەگەڵ شێوە زانستی دووەمدا هەیە. بەڵام ئایا ئەو بوونە چیەو چۆنە، كە بووە بە بابەتی لێكۆڵینەوەی فەلسەفە؟ بوون بۆ ئەریستۆ خسڵەتی خۆی هەیە، لە هەموویان گرنگتر خسلەتی هەمەكیو زەرورەن. بوون شتێكی هەندەكی وەكو ئەم مێزە یان ئەو پەڕتووكە نیەو هەمەكیەو لە هەموو شتێكدا هەیەو هێچ شتێكی هەندەكی بەبێ ئەو نابێت. لەم ڕووەوە بوون دەبێت بەبوونی هەموو بوونێك یان بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجی بۆ هەموو شتێك. لە لایەكی دیكەوە بوون زەروریە چونكە پێویستی بەبوونێكی دیكەی بۆ بوونی خۆی نیە. ئەم بۆ چوونەی ئەریستۆ لە دانانی ئەم دوو خسڵەتەدا بە بیروڕای من كارتێكەرە بۆ پێشخستنی سیستەمی ئۆنتۆلۆجی هەندێك لە فەیلەسوفە

[8] - Aristotle.Op.cit.,T1,1003a 21-26

موسوڵمانەکان وەکو ئیبن سینا، کە بوونی کردووە بە دووبەشەوە؛ بوونی زەرورەو بوونی گونجاو. لە پێناسەکردنی بوونی زەرورەدا ئەم فەیلەسوفە پەیڕەوی ئەریستۆی کردووەو بەو بوونەی داناوە، کە بۆ بوونی پەنا بۆ بوونێکی دیکە نابات و بوونی گونجاویش بەپێچەوانەی ئەمەوە بەبێ بوونی زەرورە ناتوانێت هەبێت. بۆ ڕوونکردنەوەی واتای بوون ئەریستۆ پێناسەیەکی دیکەی خستۆتە بەردەممان و گوایە بوون "پرنسیپاڵی یەکەمو هۆکارە بەرزەکانە".[9] ئەوەی لێرەدا زیاتر تووشی ئاڵۆزییمان دەکات ئەو پرسیارەیە، کە پێوەندی نێوان(بوون)و هۆکارە بەرزەکان دەخاتە ڕوو.

ئەگەر (بوون) هۆکارە بەرزەکان بێت ئەوا لێرەدا (یەك) بوون نیە چونکە ئەریستۆ باسی یەك هۆکاری بەرز ناکات و ئەو هۆکارە بەرزانەی بە چوار هۆکار داناوە. ناسینی هۆکارەکانیشی بە فەلسەفیانە(الحکمة) ناوزەدە کردووە. دانانی هۆکاری بەرز بۆ بوون بڕیار لەسەر بوونێکی لە پێشتر بۆ (بوون) دەدات و بەم شێوەیە ناگەینە سەرەتایەکی لە سەرەتابەدەر یانە بنەڕەتێکی لە بنەڕەت بەدەر، کە خۆی بوونەو بوونێکی لەپێشتر بۆ خۆی دانانێت. ئەریستۆ، خۆشی لە بەڵگە کۆسمۆلۆجیەکەیدا بۆ سەلماندنی بوونی (پرنسیپاڵی یەکەم) یان (سەدەمی یەکەم) تووشی هەمان گرفتی فەلسەفی بووەو بڕیاری داوە سەدەمی یەکەم بەدوا بنۆس

9- ibid., 1003a 26-32

و لەسەدەم بەدەر دابنێت. ئەریستۆ لە شوێنێکی دیکەدا بوونی هەمەکی بە(بوون- لەناو- خۆ) داناوە *Per se*.[10] ئەمەش هەر ئەو واتایە دەبەخشێت بوون ڕووداو *Per accidens* نیەو خۆی بناخەی خۆیەتی. بە بیروڕای ئێمە واتای بوونەکەی ئەریستۆ بەدوو شێوە لێك دەدرێتەوە؛ لە لایەکەوە بوونێکی پڕو تەواوکۆو نە گۆڕە ئەمەش بەرەو سیستەمە مێتافیزیکیەکەی ئەفلاتون پەلکێشمان دەکات و لە لایەکی دیکەوە بوونی هەمو بوونەکان و شتێکی هەمەکی‌یە، کە بوە بە بنەڕەتی بوونی هەبووە هەندەکیەکان. ئەم دوو لایەنەش دوو شێوازی ئۆنتۆلۆجیمان دەخەنە بەردەم. لەیەکەمیاندا محاڵە ئەو بوونە بە دینامیکی و گۆڕانکارییەکی هەمیشەیی دابنرێت و فەلسەفەکەشمان لەسەر زەمینەیەکی چەسپاوی لە پێشتر دادەمەزرێنێت. بوونی پڕو تەواوکۆ لە گۆڕان بەدەرەو هەرچ گۆڕانکاریەکی تێدا ڕووبدات ئەوا بوون تووشی ناکۆکی دەکات و پلەی بەرزو تەواوکۆیی لێ دەبڕێت. لە واقعیەتی ڕاستیەکی تەواوکۆدا گۆڕانکاری خراپەو نابێت ڕووبدات، چونکە ئەو ڕاستیە هیچی دی بۆخۆ- تەواوکردن پێویست نیە. گۆڕانکاری خسڵەتی بوونێکی ناتەواوە، کە بەڕێگەی گۆڕانکاری هەوڵی خۆتەواوکردن و گەیشتن بە تەواوکۆیی دەدات.

---

-[10] Aristotle. *Posterior Analytics*, I., 4, 73b 26-74a3.

لە لێکدانەوەی دووەمدا بوون بە ڕاستیەکی تەواوکۆو نەگۆڕ دانانرێت و دەبێ بە بنەڕەت بۆ هەموو شتێکی هەبوو. هەرچ شتێك هەبێت ئەوا بوونی ئەو شتە لەسەر (بوون)ە هەمەکیەکە ڕادەوەستێت، کەبەبێ ئەم ناتوانرێت بیری لێبکرێتەوەو باسیبکرێت. هەندێك لەو زانایانەی تەفسیری سیستەمی مێتافیزیکی ئەریستۆیان کردووە پەنایان بردۆتە بەر لێکۆڵینەوەی یەکەمو بوونیان بەبوونی سەدەمی یەکەم داناوە. بۆ نموونە تیوفراستۆس و ئیۆدیمۆس، کە هەردوکیان شاگردی ئەریستۆ بوون بەم شێوەیە واتای بوونیان ڕوون کردۆتەوەو بوونی هەمەکیان لەو خسڵەتە هەمەکیە دابڕیوەو بە بوونێکی بەرزو تاك و سەدەمی یەکەمیان داناوە. ئەسکەندەری ئەفرۆدیسیاس بە هەمان شێوە فەلسەفە دەکات بە زانستی بوونەوەرە بەرزەکان و ئەمیش شوێن بیروڕاکانی دوو شاگردەکەی ئەریستۆ دەکەوێت. بەگوێرەی بۆچوونەکانی ئەم زانایانە، کە لەسەر پێناسەکەی ئەریستۆ بۆ بوون ڕاوەستاون(بوون) بوە بە بوونی تاکە بوونەوەرێك و ئەو بوونەوەرەش لە بوونی بوونەوەرەکانی دیکە پچڕاوەو لە ناویاندا ناژیو بوونێکی بەرزو جیاوازی هەیە. فەلسەفەش لە ڕوانگەی ئەم باسەوە دەبێت بەلێکۆڵینەوە لە واتای بوونە بەرزەکەو لەگەڵ تیۆلۆجیدا یەکدەگرن. ئەم ئەنجامە لەخۆڕا نەهاتۆتەکایەوەو ئاکامی لۆجیکمەندانەی پێناسەکەی ئەریستۆیە بۆبوون، وەکو هۆکاری بەرز یان پرنسیپاڵی یەکەم. ئەمەش لێرەدا دەمانگەڕێنێتەوە بۆ سیستەمێکی مێتافیزیکی

ئایدیالیستانە، کەلە گەڵیدا هاوڕانین و شێوەی بیرکردنەوەی فەلسەفیانەمان دژی دەوەستێت. ئەریستۆ هەندێك پێناسەی دیکەی بۆ داناوین، کە ئەوەندە زیاتر کێشەکەمان لا ئاڵۆز دەکات. بۆ نموونە دەڵێت؛(فەلسەفە زانستی ناوەڕۆکە *ousia*، ناوەڕۆکی یەکەم)[11] یان (زانستی هۆکاری ناوەڕۆکە)[12] و(زانستی ڕاستیەو لە ناو سروشتدا زانستی فۆڕمەکانە).[13] لەم خاڵەدا بیرۆباوەڕە فەلسەفیەکەی ئەریستۆو ئەفلاتون لە یەکدی نزیك دبنەوەو جیاوازیان تەنیا لە ئەپستمۆلۆجیدا دەردەکەوێت. بۆ ئەفلاتون زانینی ناوەڕۆك یان فۆڕمەکان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی هۆشی دیالێکتیکیەوە. لە بەشێکی دیکەی پەڕتووکی مێتافیزیکدا ئەریستۆ جەختی لەسەر چەمکی (ناوەڕۆك) *Substrate* کردووەو بەبوونی داناوە،"ناوەڕۆك *Substratum* خاوەنی خسڵەتەکانەو خۆی نابێت بە خسڵەتی شتێکی دیکە"[13] بوونە هەندەکیەکان، بۆنموونە خاوەنی خسڵەتەکانن(کاتیگۆرییەکان) بەڵام خۆیان نابن بە خسڵەتی بابەتی دیکە. لەم بۆچوونەوە دەگەینە ئەو باوەڕەی بوون خسڵەت نیە *Per-accidenc* ، بەڵکو بناخەی هەموو خسڵەتەکانەو ئێمە ناتوانین خسڵەتێك بەبێ بوون بدۆزینەوە. بۆ ئەوەی ڕەنگی سور ببینین ئەوا دەبێت بە شوێن شتی سوردا، بۆ وێنە بەرگی پەرتووك، کراسێکی سور، یان

---

[11] - Aristotle. *Metaphysics*, B2, 996b31; 997 al-B
[12] - ibid., t 3, 1005 a35
Aristotle. *Physics*, I, 9, 129a 34-36
[13] - Aristotle. *Metaphysics*, Z, 3, 1029 a2

ئۆتۆمبیلێکی سوردا بگەڕێین. کێشەی بوون وەکو ناوەڕۆك شتێکی خسڵەت وەرگر یان ڕووداو لای هەندێك فەیلەسوفی موسوڵمان بۆ نموونە ئیبن سینا(979-1027)و ئیبن روشد(1126-1198) مشتومڕی لەسەر کراوەو دوای ئەمانیش ئیمانویل کانت(1724-1804)لەسەری دواوە. پاش ئەوەی ئیبن سینا بوون دەکات بە دوو بەشەوە؛ بوونی زەرورەو بوونی گونجاو(ممکن)، دووەمیان بە دراو دادەنێت و دەیکات بەخسڵەتێکی ناوەڕۆك، لە پڕۆپۆزیشنی(گۆچان شتێکە هەیە)دا دەردەکەوێت. (هەیە) دەربڕینی بوونەو بووە بە خسڵەتی گۆچان و وەکو ئەوەیە بڵێین(گۆچان خوارە) چونکە خسڵەتی (خوار)یش وەکو (هەیە) دراوە بە گۆچانەکە. بەم شێوەیە ئیبن‌سینا مامەڵە لەگەڵ بوونی گونجاو دەکات و بە تەنیا بۆ ئەم بوونی زەرورە لەگەڵ ناوەڕۆکیدا یەکیان گرتوەو لە یەکدی جیا نابنەوە.[14] ئیبن ڕوشد لە پەڕتوکەکەیدا(تهافت التهافت) لە ڕەتدانەوەی ڕەخنەکانی ئەلغزالیدا لەگەڵ بیروڕاکەی ئیبن‌سینا ناکۆکەو بوون بە ڕووداو *Per-accidenc* *دانانێت* و نایکات بە خسڵەتی ناوەڕۆك یان چیەتی بابەتێك چونکە بەبێ بوون، کە ئەمەش بە پێچەوانەی خسڵەتەکانی دیکەوەیە، هیچ بابەتێك پەیدا نابێت.[15]

---

[14]- ابن سینا، الاشارات و التنبیهات، القاهرة، 1960. لاپەڕە 332.

[15]- Ibn Rushd. *Tahafut al-Tahafut*, translated by S.Van den Bergh, London: Luzac, 1978. P.331

کانت لە بەشی سێیەمی پەڕتووکەکەیدا *Critique of Pure Reason* بە ناوی (*Transcendental Dialectic*)ئەم کێشەیەی لە ڕەخنەکەیدا لەسەر بەڵگەی ئۆنتۆلۆجی زیندوو کردۆتەوەو لەگەڵ ئیبن ڕوشد هاوڕایەو ڕەتی ئەو بۆچوونە دەداتەوە، کە(بوون) بە خسڵەتی بابەتێك دادەنێت. بە بیروڕای کانت پرۆبۆزیشنی(گۆچان شتێکە هەیە.) وەکو(سێ گۆشە سێ گۆشەی هەیە) تۆتۆلۆجی یەو خسڵەتەکە زانینێکی نوێ لە بارەی بابەتەکەوە(گۆچان و سێ گۆشە) زیاد ناکات. لەهەمان کاتدا ئەم خسڵەتە(هەیە)یان (سێ گۆشەی هەیە) بە پێچەوانەی خسڵەتەکانی دیکەوە، ئەگەر ڕەتبدرێنەوە ناکۆکیەکی لە چارەبەدەر لە پرۆپۆزیشنەکەدا پەیدا دەکات. گۆچانی گەورە یان گۆچانی تەختەو ئاسنیش هەیە. ئەگەر گوتمان گۆچان گەورە نیە، ئەم ڕەتدانەوەیە هیچ لە بوونی گۆچانەکە ناگۆڕێت و گۆچان لە فۆڕمێکی دیکەدا(بچوك) دەهێڵێتەوە. بەڵام لە کاتێکدا (هەیە) لە گۆچانەکە دادەبڕین و دەڵێین(گۆچان شتێکە نیە) تووشی ناکۆکیمان دەکات و ڕەتدانەوەکە بوونی گۆچانەکەش لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵێت. لە بەرئەمە(بوون) نابێت بە باری بابەتێك چونکە بوونی بابەتەکەیەو هەموو بارێکی دیکە بە خۆیەوە هەڵدەگرێت .[16] لەلایەکی دیکەوە کانت لەوباوەڕەدایە پرۆپۆزیشنەکان دوو شێوازیان هەیە؛ شیکاری*Analytic* و

---

[16] - Immanuel Kant. *Critique of Pure Reason*, translated by Norman Kemp Smith, London: MacMillan, 1963. A:594, B: 622.

تێهەڵکێش *Synthetic*.[17] ئەگەر پرۆپۆزیشنی (گۆچان شتێکە هەیە) شیکاری بێت ئەوا (هەیە)، وەکو (بار) بەکار هاتووەو هیچی تازەمان سەبارەت بە بابەتەکە بۆ دەرناخات. لە حاڵەتی دووەمیشدا ئەگەر پرۆپۆزیشنەکە تێهەڵکێش بێت ئەوا نابێت بە ڕەت دانەوەی ئەوبارە گۆڕان بەسەر بوونی بابەتەکەشدا بێت، ئەمەش دژوارەو دەزانین بەڕەتدانەوەی بارەکە یان بەگۆڕینی (هەیە) بۆ (نیە) گۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر بوونی (گۆچان) دا دێت. لە هەردوو حاڵەتەکەدا (هەیە) یان (بوون) نابێت بەخسڵەت و بار بەڵکو بوونی بنەڕەتی بابەتەکەو بار هەڵگرەو بەبێ ئەو ناتوانرێت بیر لەبابەتەکەش بکرێتەوە.[18] هەروەها کانت، وەکو ئەفلاتون لە ئەپستمۆلۆجیەوە ڕووی کردۆتە ئۆنتۆلۆجیو بەگوێرەی دابەشکردنی شێوازەکانی زانین بوونیشی بەسەر نومینەو فینومینە یان ڕاستەقینەو دیاردەی ڕاستەقینە دابەشکردووە. گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی، کە بوونێکی نادیار لەودیوو فینۆمینە یان جیهانی دیاردەکان خۆی شاردۆتەوەو دەسەڵاتی زانینی ئاگامەندی (هەرگیز) نایگاتێ و ناتوانێت ڕۆشنایی بهاوێتەسەر. هۆکاری دەستکورتی زانینی ئاگامەندیش لەودایە، کە

---

[17]- پرۆپۆزیشنی شیکاریAnalytic تۆتۆلۆجیەو خسڵەتی بابەتەکەی زانینی نوێ پەیدا ناکات و هیچی تازەمان لەبارەی بابەتەکەوە ناداتێ چونکە ئەوەی باسی دەکات لە پێشتر لەناو بابەتەکەدایەو بگرە بوونی بابەتەکەی لە سەر ڕاوەستاوەو لەبەر ئەمە ڕەتدانەوەی بابەتەکە دژوارو ناکۆکە. پرۆپۆزیشنی تێهەڵکێش Synthetic خەسڵەتی لە بابەتەکەیەوە جودایەو بوونی بابەتەکە بەو خسڵەتەوە گرێبەند نیەو ڕەتدانەوەشی دژوارو ناکۆك نیەو بوونی بابەتەکە لەناو نابات. نموونەی ئەمەش ئەو پرۆپۆزیشنانەن کە بە ڕێگەی زانینی هەستەکیەوە دادەڕێژرێن.

[18]- Immanuel Kant. Op.cit., A:598, B:626

ئەزمونەکانی زانین لە سنووری کات و شوێن دەرناچن و زانینەکان بە دیاردەکانەوە گیریان خواردووەو نومینەش دیاردە نیە. ئاگامەندی، بۆ ناسینی ئەم بابەتە، دەبێت خۆی بگەیەنێتە ئەودیو سنووری کات و شوێنەوەو ئەمەش کارێکی مەحاڵە، چونکە کات و شوێن دوو مەرجی لە پێشترن بۆ زانین. ئاگامەندی هەرچ ئەزمونێکی هەبێت لە ناو کات و شوێندا ڕوو دەدات و بە ئەنجام دەگەیەنرێت، بەڵام کات و شوێن ناکەونە ناو ئەزمونی ئاگامەندییەوە. بۆ نموونە من(ئێستا ) لە قاوەخانەی (گارت پلەیس)دانیشتووم و لەسەر ئەم کێشەیە دەنوسم. کاغەزەکانی سەر مێزەکەم و فنجانی قاوەکەو چەند پەڕتووکێك دەبینم و گوێم لە دەنگی خەڵکەکەی دەوروبەرمەو لە شوشەی قاوەخانەکەشەوە ئۆتۆمبیلەکان لەسەر شەقامەکە دەبینم. ئەمانە کۆمەڵێ ئەزموونی هەستەکین(ئێستا ) لەم (شوێن)ەدا ڕوویاندا. بەبێ(کات)ێکی دیاریکراوو (شوێن)ێك ئەزموونە هەستەکیەکانم ناتوانن زانینم بۆ پەیدا بکەن، بەڵام من لە ئەزموونەکانمدا ئاگام لەبوونی کات و شوێن نیە. ئەم دوو شێوازە لەپێشترە بۆ زانین، وەکو کاغەزو قاوەو مێزو ئۆتۆمبیلەکان و خەڵکەکەی ناو قاوەخانەکە خۆیان بۆ ئەزموونی هەستەکیم دەرناخەن. ئەو جیاوازییەی لێرەدا پێویستە ڕوون بکرێتەوە لە نێوان نومینەو شێوازی لەپێشتر(کات و شوێن) بۆ ئەزموونی هەستەکی ئەوەیە، کە نومینە هەرچەندە دەسەڵاتی ئەزموونی هەستەکی ناگاتێ بە پێچەوانەی ئەمەشەوە ئەوە ناگەیەنێت ئەو ڕاستەقینەیە

بەشتێکی دەرەکی دانەنرێت. کانت لە باسەکەیدا لەسەر کات و شوێن دەیەوێت داکەوتی کات و شوێن رەتبداتەوەو بەدوو فۆڕمی ناو بیرکردنەوەیان دابنێت.

نومینە بوونێکی شاراوەیەو نەزانراوە، لەهەمان کاتدا بناغەیە بۆ فینومینە(دیاردەکان)و دیاردەکان بەبێ ئەو نابن. پەیوەندی نێوان ئەم دوو ڕووەی بوون لەم بۆچوونەوە هۆکارییەوە زەرورەیەکی لۆجیکمەندانەیان لە نێواندا پەیدا دەکات. دیاردە بەبێ بوونی شتێك ، کە خۆی دەرخستوە نابێت، بەڵام ئەو شتە لای کانت لەودیو دیاردەکەوەیەو ناناسرێت و هەمیشە بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. بەم شێوەیە کانت دەگاتە دۆگمایەکی گومانکاری و خۆی تووشی ناکۆکی دەکات. نادیاری و شاراوەیی نومینە ڕێگەمان پێنادات بیناسین و لەسەری بدوێین، کەچی کانت خۆی، کە خاوەنی ئەم بیروباوەڕەیە کۆمەڵێك زانیاری لەبارەی نومینەوە پێ ڕاگەیاندووین و پێناسی بۆ داتاشیوە. لە لایەکەوە دەڵێت مەحاڵە ئێمە بتوانین لە بارەی نومینەوە بزانین و لە لایەکی دیکەوە باسی نومینەمان بۆ دەکات. ئەگەر ئێمە نەزانین شتێك هەیە ناتوانین باسی بکەین. شاراوەیی ڕاستەقینەو نەناسینی کێشەیەکی گەورەیە بۆ هەموو سیستەمێکی ئۆنتۆلۆجی و تووشی گرفتێکی گەورەمان دەکات. ئاگامەندی هەمیشە لە هەموو قۆناخێکی مێژوودا هەوڵیداوە ڕاستەقینە

بناسێت و لەو ناسینەوە مامەڵە لەگەڵ جیهانی دەرەکی و بوونی خۆیدا دەکات و بەرهەمی زانینەکانی لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەبینێ. لە سیستەمی ئۆنتۆلۆجی (کانت) دا (ڕاستەقینە)هەیە بەڵام نازانین چۆن هەیەو چیەو چ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئێمەدا هەیە. ئێمەش لە ئاستی ناسینی ئەودا نەك کورت بینین بەڵکو ئیفلیجین و هەرگیز پێی ناگەین. کانت بەتەنیا دووری ڕاستەقینەی باس نەکردووەو دەسەڵاتی زانینی ئەو ڕاستەقینەیەشی لە ئاگامەندی سەندۆتەوەو ئاگامەندیش ، کە بەنەزانی پەیدا بووە بە نەزانیەوە کۆتایی بە مێژووی خۆی دەهێنێت و هەولدانەکانی بۆ تێگەیشتن لەواتای بوون بێ هودە دەبێ و بە نامۆیی لەو ڕاستەقینە دەژی.

کێشەی نامۆ بوونی ئاگامەندی لە ڕاستەقینەوە لە فەلسەفەکەی (کانت)دا بەزەقی خۆی دەرخستوەو(هیگڵ)یش یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی پاش کانت ڕەخنەی لێگرتبێت. هەوڵدانی هیگڵ، لەسەرەتاوە، لەسەر ڕەتدانەوەی ڕاڕەوی دووە لیستی ئۆنتۆلۆجی ڕاوەستاوەو لەم ڕەتدانەوەیەوە(بوون)ی بە یەك ڕاستەقینە داناوە، کە لەپرۆسەی خۆ تەواوکردنیا دیاردەکان بۆ خۆ دەرخستن و خۆ پیشاندان پەیدا دەکات. هیگڵ لەدوو شوێندا باسی(بوون)ی کردووەو واتاکەی بۆ ڕوونکردوینەتەوە. یەکەم لەسیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا دووەمیش لە

لۆجیکەکەیدا. ئێمە لەپێشدا واتای بوون لە سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا شیدەکەینەوەو دوای ئەمە دەچینە سەر لۆجیکە دیالێکتیکیەکەی.

بەبیروڕای هیگڵ نامۆیی ئاگامەندی بارودۆخێکی زەرورییەو ئاگامەندی تێدا دەڕوات. زەرورەتی نامۆییش لەوەدانیە، کە هێزێکی دەرەکی بێجگە لە ئاگامەندی ئەم بارودۆخەی هێنابێتەکایەوە. زەرورەتێکە ئاگامەندی بۆ خۆ- تەواوکردن و گەیشتن بە ترۆپکی تەواوکۆیی پەیدای کردووە. ئەو دەزانێت، کە جیهانی دەرەکی، وەکو ڕاستەقینەیەکی پچڕاو دوورە پەرێز ڕاوەستاوەو دژایەتی لەگەڵ ئاگامەندیدا دەکات. لە هەمانکاتیشدا جیهانی دەرەکی ڕاستەقینەیەکی جیاوازنیەو زادەی ئاگامەندییە. لێرەدا پەیوەندی دیالێکتیکی لە نێوان ئاگامەندی و جیهانی دەرەکیدا پەیدا دەبێت. لە لایەکەوە جیاوازن و لە لایەکی دیکەوە یەکگرتوو. جیاوازیان لە یەکگرتنیاندایەو یەکگرتنیشیان لە جیاوازییەکەیاندا. لەبنەڕەتدا یەك ڕاستین و ئەو بوونە هەمەکیو گشتگرەیە لەپێشتردا باسمانکرد. لەم ڕووەوە، بوون بۆ هیگڵ بووە بە ئاگامەندی و جیهانی دەرەکیش زادەی بیری ئاگامەندییەو ڕاستەقینەیەکی سەربەخۆ نیە. ئەوەی هەیە ئاگامەندی و دیاردەکانی ئاگامەندییەو بزوتنەوەی دیالێکتیکیش بزوتنەوەیەکی ئاگامەندانەیە.

جیاوازی ناوەڕۆکیی نێوان ئۆنتۆلۆجی هیگڵ و ئەریستۆ لەوێدا سەرهەڵدەدات، کە هیگڵ بە پێچەوانەی ئەریستۆوە(بوون) Being *qua* Being بە ڕاستەقینەیەکی پڕو نەگۆڕ دانانێت و لەو باوەڕەدایە ناتەواوو نەناسراوەو بۆ خۆ تەواوکردنی پێویستە خۆی تووشی نامۆیی، وەکو دەرچوونی جیهانی دەرەکی لە خۆیەوە، بکات و لەهەمانکاتدا هەوڵبدات لە ڕێگەی یەکگرتنیەوە لە گەڵ جیهانە دەرەکیەکەدا بەسەر نامۆییدا زاڵبێت. ئەمەش دەمانگەیەنێتە ڕاڕەوی یەکانەگی بوون Pantheism، کە زانایانی وەك شەهاب الدین سوهرەوەردی(المقتول)و ئیبن عەرەبی و لە ڕۆژئاواش چەند زانایەکی ئیلیایی و ئێکارت و برۆنۆو سپێنۆزا مامەڵەیان لە گەڵدا کردووەو سیستەمە فەلسەفیەکەیان لەسەر دامەزراندوە. با ئەو خاڵەگرنگەشمان لە بیر نەچێت، کە بۆچوونەکانی هیگڵ لە بۆچوونەکانی برۆنۆو سپینۆزاوە جیاوازن و لەسەر چیەتی ڕاستەقینەی (بوون) هاوڕانین. (بوون) لای برۆنۆو سپینۆزا، کە بە Substance ناسراوە پڕو لەگۆڕانبەدەرەو ناکەوێتە ناو بازنەی(کات)ەوە. بۆ هیگڵ گۆڕانکاری (دیالێکتیکی) خسڵەتێکی بنەڕەتی بوونەو بوون بەبێ گۆڕانکاری ناتوانێت خۆی بگەیەنێتە ئەو قۆناخەی تیایدا نامۆنیەو لەگەڵ جیهانی دەرەکیدا هیچ جیاوازییەکی نیە. گۆڕانکارییەکانی بوون مێژووی نامۆبوونەو فەلسەفەش بۆ ئەم فەیلوسوفە داستانی نامۆبوونە. هەوڵدانەکانی ئاگامەندی بۆ لەناوبردنی

نامۆیی لەناو (کات)دا ڕوودەدات و(مێژوو) دەخولقێنێت. گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو، کە دیالێکتیکانە مەبەستی لە پێشتریان بۆدانراوەو هەمیشە بەرەو پێشکەوتن ڕەوتدەکەن و فۆرمو ناوەڕۆکێکی باشتر لە سبەینێدا بە ژیان دەدەن و ئەمرۆ لە دوێنێ باشترو سبەینێش لەمرۆ باشتر دەڕازێننەوە. هیگڵ لەم ڕوانگە گەشبینیەوە ڕوداوەکانی ناو مێژوو بە زەرورەو پڕ واتا دادەنێت و لە پێناوی گەیشتن بە تەواوکۆیی لەژێر کارتێکردنی ئاگامەندیدا لە دایك دەبن و دەمرن. لە بەر ئەمە هیچ ڕوداوێك یان گۆڕانکاریەك لەمێژوودا بێ (مەبەست)و کوێرانە نیەو بوون بەگشتی تەنێکی زیندوو ئاگامەندانەیەو لەسەر پلانێکی هۆشەکی، کە خۆی نەخشەیکێشاوە، دەسوڕێتەوە. هیچ شتێك لە دەرەوەی ئەم پلانەدا نیەو هیچی بۆ زیاد ناکرێت و هیچی لێکەم ناکرێتەوە. بوون، هەر چەندە لە گۆڕانی دیالێکتیکیدا دەژی، سیستەمێکی داخراوەو بە ئاگاوە سەرپەرشتی هەموو بابەت و ڕوداوە هەندەکییەکان دەکات و هەموویان لەژێر کارتێکردن و نەخشەی ئامادەکراوی خۆیدا داڵدە دەدات. بە بیروڕای من پەیوندی نێوان ئاگامەندی و جیهانی دەرەکی، ئەگەر لە شێوازە دیالێکتیکیەکەیدا باسی نەکەین، دەتوانین بڵێین بیرو باوەڕەکەی هیگڵ و سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەی لە سیستەمی (ئەفلاتونیەتی نوێ)وە نزیکە. ئەفلاتونیەتی نوێ، کە ئەفلوتین(205-170)بە خاوەنی دادەنرێت هەندێك زاناو فەیلەسوفی موسڵمانیش، وەکو ئیخوان ئەلسەفاو

ئەلفارابی و ئیبن سینا سوودیان لێ وەرگرتووەو کردوویانە بەبناخەی سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەیان، جیهانی دەرەکی بە ڕاستەقینەیەکی (دەرچوو)لە (بوونی یەکەم)ەوە دادەنێ .[19] ئەلفارابی دێمانە ڕامیارییەکەشی لە پەڕتووکی(آراء اهل المدينة الفاضلة)دا لەسەر ئەم سیستەمە داناوەو پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵی لەگەڵ پەیوەندی نێوان بوونی یەکەم و جیهاندا بەراورد کردووەو بە زەرورەی داناوە. هۆکاری نزیك بوونەوەی فەیلەسوفە موسوڵمانەکان لە ئەفلاتونیەتی نوێ و ڕاڕەوی دەرچوون Emanation لەوەدایە، کە ئەم فەیلەسوفانە لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ فەلسەفەو لۆجیکی ئەریستۆدا تووشی ناکۆکی بوون. بە گوێرەی لۆجیکی ئەریستۆ شتێك لە هیچەوە پەیدا نابێت *Ex nihilo nihil fit*. بۆ ئەوەی جیهان ئافەرید بکرێت (سەدەمی یەکەم) پێویستی بە ئەستویەکی لە پێشتر هەبووەو ئەو ئەستویەی هێناوەو فۆرمی تازەی لە سەر نەخشاندووەو ئەم جیهانەی لێ پەیدا کردووە. بۆچوونی مێتافیزیکی ئەریستۆ لەگەڵ بیردۆزی ئافەریدکردنی جیهان

---

[19]- ڕارەوی دەرچوون Emanation لەسەرەتادا لە فەلسەفەی هیندیدا(بەکتی ڤیدەنتا)لە ناو پەڕتووکی(باگڤید گیتا)دا باسکراوە. ئەفلوتینیش کە ڕابەری فێرگەی(ئەفلاتونیەتینوێ)یە کردوویەتی بە بناخەی سیستەمە مێتافیزیکیەکەی. ئەفلوتین لە شاری لیکۆپۆلس لە میسر لە دایك بووەو دوایی چووە بۆ ڕۆم و خوێندنگایەکی بۆ فێر بوونی فەلسەفە دامەزراندوە. ئەم فەیلەسوفە لە ژێر کارتێکردنی فەلسەفەی ئەفلاتون و مەسیحایەتی لە کێشە فەلسەفیەکان دواوە. پۆرفری *Porphyry* یەکێك لە شاگردەکانی بەرهەمەکانی لە شەش بەرگدا بەناوی *Enneads* بڵاوکردۆتەوە و چەند پەڕتووکێکی ئەم بەرگانە لە سەدەمی مەئمون لە بەغدا لەلایەن ئەلکندی(فەیلەسوفی موسوڵمان) کران بە عەرەبی، بەڵام ئەلکندی بە هەلە ئەریستۆی کرد بە خاوەنی ئەم بەرهەمانە.

لە ناو قورئاندا، کە گوایە بوون لە هیچەوە ئافەریدکراوە *Creatio ex nihilo* ناگونجێت.[20] فەیلەسوفە موسوڵمانەکان، کە لەپێشتر ناومانبردن، نەیانتوانیوە یەکێك لەم دوو لایە(بیردۆزی ئەریستۆو قورئان) ڕەتبدەنەوە. خۆ ئەگەر لەگەڵ بیروڕاکەی ئەریستۆ بوونایە ئەوا دەبوایە باوەڕیان بەدوو ڕاستی ئەزەلی و ئەبەدی بهێنایە، کە ئەمەش لەگەڵ ناوەڕۆکی ئیسلامدا ناکۆکەو وازهێنان لە فەلسەفەو گەڕانەوە بۆ (بڕوا)ش بۆ ئەمان هەڵوێستێکی ڕۆشنبیرانە نەبوە. بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم ناکۆکیەدا فەلسەفەی ئەفلاتونیەتی نوێ ڕێگەچارەو بەدیلێکی فەلسەفیانە بووە، کە بەپێچەوانەی ئەریستۆوە ئەستو بە هەمیشەیی دانانێت و، وەکو بیردۆزە قورئانیەکەش(هیچ)ناکات بەسەرچاوەی (بوون). لە ڕاڕەوی دەرچوندا جیهانی دەرەکیو بوونی یەکەم لەناو یەکدانین، چونکە جیهانی دەرەکی لە بوونی یەکەمەوە دەرچووەو لێی جیابۆتەوە، ئەمەش لە فەرهەنگی سۆفیگەریدا، وەکو بۆچوونەکەی هیگڵ نامۆیی ئۆنتۆلۆجیە، لەهەمانکاتیشدا جیهانی دەرچوو لە بوونییەکەمەوە جیاواز نیەو بوونی یەکەم سەرچاوەی جیهانە. جیهانی دەرچوو بوونی یەکەمەو ئەویش نیە. وەکو ئەوەو وەکو ئەویش نیە، ئەمەش ئەو پەیوەندییە دیالێکتیکیەیە هیگڵ لەنێوان ئاگامەندی و جیهانی دەرەکیدا بۆی ڕوونکردوینەتەوە. ئیبنسینا بەشێوەیەکی دیکە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم

---

[20]- بڕوانە: قورئان، 2:117، 16: 40

پەیوەندیە زاراوەی تازەی بەکار هێناوە وەکو بوونی زەروری‌و بوونی گونجاو. بوونی زەروری بوونی یەکەمەو بێ ئەوەی پێویستی بەبوونێکی دیکە هەبێت دەتوانێت ببێت و سەرچاوەی بوونی گونجاویشە. بوونی گونجاو لەبوونی زەرورییەوە دەرچوەو بەبێ ئەو نابێت، واتە بوونی گونجاو بۆ پەیدا بوونی پەنا دەباتە بەر بوونی زەروری. ئەمەش لە لای ئیبن‌سینا بۆ سەلماندنی بوونی(بوونی زەروری) یان (بوونی یەکەم)بووە بە بەڵگە.[21]

لە لۆجیکی دیالێکتیکی (هیگڵ)دا (بوون) بووە بەیەکەم کاتیگۆری‌و بنەڕەتی هەموو کاتێگۆریەکانی دیکەو ڕاستەوخۆ دەناسرێت. لەبەرئەوەی بنەڕەتی هەموو کاتیگۆریەکانی دیکەیە، بوون لێرەدا هەمەکیەو خسڵەتێکی تایبەتمەندی نیە. بوونی هەموو شتێکەو هیچیشە، چونکە وەکو مێزەکەی بەر دەمم یان کاغەزەکانی ژێر دەستم هەندەکی نیەو بەرێگەی زانینی هەستەکیەوە نادۆزرێتەوەو بوونێکی ڕەوانە Pure Being.[22] ئایا مەبەستی هیگڵ لە ڕەوانی بوون چیە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا حەز دەکەم نموونەی مێزەکەی بەردەستم بهێنمەوە. مێزەکە لە تەختە دروستکراوەو ڕەنگی زەردەو ڕەقەو فۆڕمێکی تایبەتی هەیەو لوس

---

[21]- ابن سینا، کتاب النجاة، القاهرة، 1960. لاپەڕە 332

[22]- Hegel F.w. *Encyclophedia of Philosophical Seiences*, Part one, translated by William Wallace, London: Oxford University Press, 1985. Section 86

و سارده. هەموو ئەم خسڵەتانە بە ڕێگەی هەستەکانمەوە بەمن گەیشتون. ئەگەر ئەم خسڵەتانە یەك لە دوای یەك لە مێزەکە دابڕین و لێی جیاکەینەوە ئەوەی دەمێنێتەوە (بوون)یکە، کە خسڵەتی نیەو (هیچ)ە.[23] مێزەکە بەو خسڵەتانەیدا دەناسرێت و بە بێ خسڵەتەکان ئەوەی هەیە(بوون)ێکە، کە ناتوانین باسی بکەین و بوونی شیبکەینەوە. لێرەدا بۆچوونەکەی هیگڵ لەگەڵ بۆچوونی (کانت)دا هاوڕایە. هەردوو ئەم فەیلەسوفانە وەکو ئیبن ڕوشد هەوڵیانداوە ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەن، کە(بوون) ناکات بە خسڵەتی بابەتێك و بەڵکو بە پێچەوانەوە بوون دەکات بە بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی زەروری بۆ خسڵەتەکان. لە لایەکی دیکەوە هیگڵ کاتیگۆری(هیچ) یان (نەبوون)ی لەم بوونە ڕەوانەوە دەرهێناوەو کردوویەتی بە سەرچاوەی(نەبوون)، ئێمە ئەم بۆچوونە ڕەتدەدەینەوەو لەو باوەڕەداین بوونێکی پڕ نابێت بە سەرچاوەی نەبوون و ئەم خاڵەش لە بەشێکی دیکەی باسەکەماندا بەدرێژی ڕووندەکەینەوە.

دەبینین توێژینەوەکەی ئەریستۆ لەمەڕ مانای بوون تاکو ئەمڕۆ مشتومڕی لەسەرکراوە. ئەمەش وابەستە بە ئاڵۆزی توێژینەکەوە، کە لە لایەکەوە بوون بە هەمەکی و گشتگرو بنەڕەتی هەموو بوونە هەندەکیەکان دادەنێت و لەلایەکی دیکەوە دەیکات بە بوونێکی بەرزو تاك و سەدەمی

[23]- بڕوانە: Muhammad Kamal, *Hegel's Metalogic*, Karachi: Royal Book co., 1989. P.28

یەکەم بۆ جیهان. ئەم دوو شێوازی لێکدانەوەیە بەدوو جۆری ناکۆك و دژ وەستاو ڕاڤەی ڕاستی بوونمان بۆ دەکەن. شێوازی یەکەم بەتەنیا بوونە بەرزەکە بەڕاستی لە قەڵەم دەدات و جیهان دەکات بە پاشکۆو ئافەریدەکراوی ئەو. دووەمیشیان ڕاستی بوون و جیهان لە یەکدی جیاناکاتەوەو باوەڕ بەڕاستیەك لە دەرەوەی جیهاندا ناهێنێت، چونکە ئەوەی هەیە بوون و دیاردەی بوونە، یان بوون و ڕاستی بوونە، کە لەیەکدی ناپچڕێن و بەبێ یەکدی نابن. بوون ڕاستی‌یەو ڕاستیش بوونە. گرفتی ڕێگەی توێژینەوەکەمان واتای ئەم بوونەیە، کە لەگەڵ (ڕاستی)دا هاوتا دامانناوەو کردوومانە بە بنەڕەتی هەموو بوونێکی هەمەکی. لەم سەرەتایەشەوە شێوازی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە بۆ واتای بوون لای ئەریستۆ ڕەتدەدەینەوەو لێکۆلینەوەی دووەم دەکەین بە خاڵی دەستپێکردنی گەشتەکەمان. بەڵام چۆن بتوانین (بوون)، کە نابێت بەخسڵەتی هیچ بابەتێك باسبکەین و لە واتای بکۆڵینەوە؟ ئایا ئەو (بوون)ە چیە بوە بە بنەڕەتی هەموو شتێك و باسیشی ناکرێت؟ یان بۆچی نەتوانین پێناسەیەکی بۆ دابتاشین و وەکو بابەتێك ناوەڕۆکی بناسین؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لەبەردەم پڕۆژەیەکی (ئۆنتۆلۆجی) دا ڕاماندەگرێت، کە هایدیگەر بەدرێژایی تەمەنی هەوڵیداوە بیگەینێتە ئەنجام و ئۆنتۆلۆجیەیێکی نوێ بەناوی (ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی) بهێنێتەکایەوە. ئایا هایدیگەر توانیویەتی وەڵامی ئەم پرسیارانەمان بۆ

ئامادە بکات؟ پێش ئەوەی مامەڵە لەگەڵ وەڵامی ئەم پرسیارانە لەسەر وەڵامدانەوەی هایدیگەر بکەین، بابزانین ئەم فەیلەسوفە چۆن ڕێگە چارەی بۆ گرفتەکە دۆزیوەتەوە.

هایدیگەر لەگەڵ ئەو بیریارانەدا هاوڕا نیە، کە بە بۆچوونی ئەوان (بوون) پێناسەی بۆ دانانرێت و ناڕەزایی خۆی بەرامبەر فەیلەسوفەکانی پاش ئەریستۆ لەسەر ئەم خاڵە دەربڕیوە. بەگوێرەی فەیلەسوفەکانی پاش ئەریستۆ، لەبەر ئەوەی(بوون) شتێك نیە پێناسە بکرێت، ئەوا پێویست ناکات خۆمان بە لێکۆڵینەوە لەسەر واتاکەی بەسەربەرین. ئەمەش ئاکامێکی نەرێی، وەکو ئاکامی بۆچوونە مێتافیزیکیەکەی کانت لەدوایە. ئەگەر (بوون) بنەڕەتی هەموو شتێك بێت و ئەو بنەڕەتەش نەناسراو بێت ئاگامەندی ناتوانێت نەژادو بنەڕەتی خۆی و شتەکانی دیکە بدۆزێتەوەو لەو نەژادو بنەڕەتەش نامۆ دەبێت. ئاگامەندی لەژێر ئەم بارو دۆخەدا(ڕاستی) ناناسێت و بە نەزانی و دوور لەڕاستیەوە دەمێنێتەوەو بابەتی بیرکردنەوەی دەبێت بەشتێکی ناڕاست. بەڵگەی فەیلەسوفەکانی پاش ئەریستۆ بۆ گەیشتن بەم ئاکامە نەرێیە ناماقوڵ نیە. ئەوان پەیڕەوی لۆجیکی ئەڕیستۆیان کردووەو لەو سیستەمە لۆجیکیەدا شتێك پێناسە دەکرێت، کە(*Genus*)جینسێکی لە پێشتری هەبێت و جیاوازیەکەشی لەگەڵ شتێکی دیکەدا بەراورد بکرێت. (بوون)

بنەڕەتی هەموو شتێکەو جینسێکی لە پێشتری نیە، لەبەر ئەمە یاسای لۆجیکی ئەریستۆ بۆ داتاشینی پێناسە بەسەردا ناسەپێنرێت و (بوون) پێناسە ناکرێت.[24] ئەم بۆچوونە، وەکو باسمانکرد، لەسەر بیرکردنەوەیەکی لۆجیکمەندانە ڕاوەستاوەو نکۆڵی لێ ناکرێت. مادامەکی (بوون) جینسێکی لەخۆی گەورەتری نیە ئەوا پێناسەی بۆ دانانرێ. با ئەو خاڵەشمان لەبیر نەچێت، کە یاساکەی ئەریستۆ بەسەر بوونە هەندەکیەکاندا ساخ دەبێتەوەو ئەوە ناگەیەنێت، کە ڕێگە لە ئێمە بگرێت و نەوێرین خۆمان لەقەرەی کێشەکە بدەین. ئەگەر بە دیدی ئەریستۆ یان فەیلەسوفەکانی پاش ئەو (بوون) لەبەر ئەوەی هەمەکیە پێناس نەکرێت بۆ ئێمە لەمڕۆدا گرنگە هەوڵی لێکدانەوەی واتاکەی بدەین و لەو ڕاستیە تێبگەین، کە بنەڕەتی بوونی ئێمەو هەموو شتەکانی دیکەیە. کاتی ئەوە هاتووە ئاگامەندی لە واتای بوون بگات و خۆی لەدەست نامۆیی لەو ڕاستیەوە ڕزگار بکات.

شێوەی توێژینەوەی واتای (بوون) سیستەمێکی ئۆنتۆلۆجیمان بۆ دادەمەزرێنێت، کە بەپێچەوانەی ئۆنتۆلۆجیەکانی دیکەوە بنەڕەتیە. ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی لەبەشێك یان لایەنێکی بوون ناکۆڵێتەوەو

---

[24]- بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە بڕوانە: محەمەد کەمال، ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی و بوونی مرۆڤ، دەزگای هەوار، ئەدیلاید، 2001، لاپەڕە 13- 14

(بوون)بەگشتی Being *qua* Being دەكات بە بابەتی لێكۆڵینەوەكەی. لەبەرەی (بوون)ی گشتگر بنەڕەتی هەموو شتێكە توێژینەوەكەشمان لەمەڕ ئەو دەبێت بەبنەڕەتی.[25](بوون)ی گشتگر لە زمانی ئاڵمانیدا بەم شێوەیە *Sein* و بوونە هەندەكیەكانیش بە *Seinden* دەنوسرێت و هایدیگەر ئەم دوو شێوە نوسینەی لە فەلسەفەكەیدا بۆ ئەم دوو فۆڕمەی بوون بەكارهێناوە. لەزمانی ئینگلیزیدا (Being)و(being)، بە پیتی گەورەی(B) بۆ بوونی گشتگرو بچوك(b)بۆ بوونی هەندەكی دانراون. لای فەیلەسوفە موسوڵمانەكان، بەتایبەتی ئیبن عەرەبی (الوجود) و (الموجود)ی بۆ ئەم دوو فۆرمەی بوون داتاشیوەو لە بۆچوونە(یەكانەگی)یەكەیدا هەموو شتێك بە(الوجود) داناوەو تەنانەت كێشەی (لاإله إلا الله)ی كردووە بە (لاموجود إلا الله)، كە بە دیدی من دەتوانرێت بكرێت بە(لاموجود إلا الوجود)، چونكە ئەو ڕاستیەی ئیبن عەرەبی باوەڕی پێدەكات (الوجود)ە، یان بوونە گشتگرەكەیەو هەموو موجودێك یان هەبوویەك تیایدا پەیدا بووە. حەزدەكەم لەم ڕوونكردنەوەیەدا باسی مەلاسەدرەئەلدینی شیرازی(كە بە مەلا سەدر ناسراوە) بكەم. مەلا سەدر، وەكو فەیلەسوفێكی ناكۆك لەگەڵ ڕێبازی ناوەڕۆكگەری سوهرەوەردیو مامۆستاكەشی(میر داماد) بوونی كردووە بە بنەڕەت و ئۆنتۆلۆجی زیندوو كردۆتەوە. بۆ مەلا سەدر بوون نەك ناوەڕۆك

---

[25]- Martin Heidegger. *Being and Time*, translated by John Macquarrie and Edward Robinson, London: Blackwell, 1992. P.31

بنەڕەتێکی یەکگرتووی هەبوەکانەو ناوەڕۆك بەبێ بوون نابێت و ناتوانێ بوونی هەبوویەك پەیدا بکات. ئەمەش لەگەڵ بیروباوەڕی سوهرەوەردی و شوێنکەوتووانی فەلسەفەی ئیشراقیدا ناکۆکە، کە بوون بە چەمکێکی هۆشەکی دادەنێت و باوەڕ بە بابەتیەتی بوونی ناکات و هەموو شتێکیش بۆ ناوەڕۆك (ماهیەت) دەگەڕێنێتەوە. مەلا سەدر لە پەڕتووکەکەیدا (الاسفار الأربعة) هەوڵیداوە بە بەڵگەی لۆجیکمەندانە بۆچوونە ئۆنتۆلۆجیەکەی سەقامگیر بکات. ئەم لەو باوەڕەدایە ئەگەر(بوون) چەمکێکی هۆشەکی بێت و خاوەنی کیانێکی ئۆنتۆلۆجی لەدەرەوەی بیرکردنەوەدا نەبێت، چۆن دەتوانین بۆچوونی (خوا) بسەلمێنین؟ چونکە لەم حاڵەتەدا بەگوێرەی بۆچوونی ئیشراقیەکان بوونی (خوا)ش دەبێت بە چەمکێکی ناو بیرکردنەوەو هیچی‌تر.کەوابوو، ئەوەی گرینگە هەبێت(بوون)ە نەك ناوەڕۆك و دەبێت لە پێشتر دابنرێت و ناوەڕۆکیش تەنیا ئەو خسڵەتانەیە، هەبووەکان، وەکو مرۆڤ و درەخت و ئەسپ لە یەکدی جیا دەکاتەوەو لەهەمان کاتیشدا (مەحدود) یان دەکات. بۆڕوونکردنەوەی ئەم دوو فۆرمەی بوونیش لای ئێمە، لە ئێستاوە بوونە گشتگرەکە بە (بوون)و بوونە هەندەکیەکانیش بە(هەبوو) ناوزەد دەکەین و بەم شێوەیە *Sein* یان Being الوجود (بوون)ە و *Seinden* یان being یا الموجود لە زمانی فەلسەفەی ئێمەدا دەبێت بە (هەبوو). شتێکی هەبوو، وەکو مێزەکەی بەردەستمان هەندەکیەو بە بێ(بوون) نابێت و ناتوانێت ببێت

بە بنەڕەت بۆ بوونی خۆی و شتێکە هەیە. (بوون) بە پێچەوانەی شتێکی هەبووەوە لە بنەڕەت بەدەرەو بۆ بوونی خۆی پەنا بۆ بوونێکی دیکە نابات و پێش هەموو هەبووەکان دەکەوێت و بنەڕەتێکی زەروری و لە پێشترو بیٚ(غایە)یەو وەکو ڕاستیەکەی ئەریستۆ دەسەڵاتێکی هۆشەکی ڕەها نیە تاکو نەخشەو (غایە)ی هەبووەکان لە پێشتر ئامادە بکات.

ئێستا هەوڵ دەدەم وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، کە لەوەو پێش ئاماژەمان بۆ کردو ڕوونیدەکەمەوە چۆن هایدیگەر مامەڵە لەگەڵ ئەم کێشەیەدا دەکات. بە بڕوای من هایدیگەر نەیتوانیوە وەڵامێکی ڕاستەوخۆو رەوانمان بداتیٚ و واتای (بوون) بخاتە بەردەممان. ئەمەش بۆتە هۆکارێك بۆ لێکدانەوەی جۆراو جۆر لەمەڕ واتای بوون لای هایدیگەر. پێش ئەوەی بێمە سەر وەڵامەکەی هایدیگەر، بۆ سەلماندنی دروستی ئەم بیروڕایە، لێکدانەوەی هەندێك بیریار باسدەکەم، کە هەوڵیانداوە لەواتای بوون لە فەلسەفەی هایدیگەردا تێبگەن. جۆزیف کۆکلمانس بوونی لە لای هایدیگەر بەپڕۆسەیەکی دینامیکی داناوە، کەبەڕێگەی خۆدەرخستنی بوونەوە ڕاستیش پەیدا دەکات.[26] لێرەدا کۆکڵمانس بوونی لەگەڵ هۆشی ڕەهای *Geist* هیگڵدا بەراورد کردووەو لەڕوانگەیەکی هیگڵیەوە تەماشای کێشەکەی کردووە. بێگومان ئەم کارە ڕەوایەو لەوێدا سەر

---

26- Joseph J. Kockelmans. *On the Truth of Being: Reflections on Heidegger's later Philosophy*, Indiana University press,1984. P.54

هەڵدەدات، کە هایدیگەریش، وەکو هیگڵ (بوون) لە(کات) جیاناکاتەوەو بەدینامیکی دادەنێت.[27] لەم ڕووەوە هایدیگەر لەگەڵ بۆچوونە ئۆنتۆلۆجیەکەی ئەریستۆدا ناکۆکە چونکە ئەریستۆ بوونی، وەکو پرنسیپاڵی یەکەم لەناو بازنەی کاتدا دەرهێناوەو بە نەگۆڕی داناوە. ئەمەش زیاتر بۆچوونێکی ئەفلاتونیەو لەناو سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەی ئەریستۆدا ماوەتەوە.

هیوبەرت درایفوس لەگەڵ کۆکڵمانس هاوڕانیەو جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکات، کە بوون لەلای هایدیگەر بە پرۆسە دانانرێت.[28] ویلیەم ڕیچەردسەن هەردوو ڕاکانی ئەو دوو بیریارەی پێشوو بەدروست دادەنێتو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونەکانی هایدیگەر خۆی، کە لەلایەکەوە بوون و جیهان بەیەك شت دادەنێت و لەلایەکی دیکەوە دەڵێت بوون ڕەوانەو وەکو جیهان فۆڕمێکی پێدراوی نیە.[29] میشێڵ زیمەرمان بوونی بە گۆڕانکاریەکانی مێژوو داناوەو، کە لە ڕێگای ئەوانەوە خۆی دەردەخات.

---

[27]- بڕوانە بەرهەمێکی نوسەر:

Mahammad Kamal, "Critique of Heidegger's Understanding of the Meaning of Being", *Indian Philosophical Quarterly*, No. 3, July 2001, The University of Poona, India.

[28]- Hubert L. Dreyfus. *Being-in-the-World: A Commentary on Heidegger's Being and Time, Division I,* The MIT press, 1991. P.11

[29]- William J. Richardson. *Heidegger: Through Phenomenology to Thought*, Dan Haag: Matinus Nijhoff, 1963. P.152

ئەمەش لە ڕاکەی کۆکڵمانسەوە نزیکەو گۆڕانکاری، کە پرۆسەیەکی دینامیکیە لە هەمانکات دا(کات)یە.[30]

هایدیگەر دەڵێت،"بابەتی لێکۆڵینەوەکەمان بوونی بابەتەکانە نەك بابەتەکان".[31] ئەمەش لەخۆیدا کێشەیەکی مێتافیزیکیەو ژوور بابەتەکان یا هەبووەکان دەکەوێت و لە (بوون) یان دەکۆڵێتەوە. بۆ نموونە، هایدیگەر نایەوێ پێمان بڵێت (مێز) چیە، بەڵکو پرسیار لەبوونی مێزەکە دەکات و دەیەوێت ئەوە بناسێت، کە بوونی مێزەکەی لەسەر ڕاوەستاوە. لەبەر ئەمە ئەو بنەڕەتەی هایدیگەر بەشوێنیدا وێڵە مێزەکە نیەو ڕاستیەکە لەژوور بوونی مێزەکەوە خۆی داناوەو بەبێ ئەو مێزەکە نابێت. بەناسینی مێزەکەش، کە بابەتێکی هەستەکیەو بەهۆی ئەزموونی هەستەکیەوە دەناسرێت، ئەو بناخەیە نادۆزرێتەوە. ئەگەر بەوردی لە سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەی هایدیگەر تێنەگەین، دەشێت توشی ئەو هەڵە فەلسەفیە ببین، کە سیستەمەکەی دەخاتە ڕیزی مێتافیزیکی ئەفلاتون یان ئەریستۆوەو دەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی ئەمیش، وەکو ئەوان باوەڕی بەڕاستیەکی بەرزو دوور هەیە. هایدیگەر نایەوێت خۆی لەم کێشەیە بدات و ڕاستی یان (بوون) بە بەرزو دوور دانانێت و لە بابەتە

---

30- Michael Zimmerman. *Heidegger's Confrontation with Modernity, Technology, Politcs, Art*, Indiana University Press, 1990. P. 116

31- Martin Heidegger. Op. cit., p.26

هەبووەکانیش ناپچڕێنێت. (بوون) بنەڕەتەو هەموو شتێکی لەسەر ڕاوەستاوە. هەرچەندە ئەو بنەڕەتە بە شتێکی جیاواز دادەنرێت بەڵام ئۆنتۆلۆجیانە لە هەبووەکان دانابڕێت. بوون و هەبوون تەواوکەری یەکدینو جیاکردنەوەیان لەیەکدی مەحاڵە. لە شوێنێکی دیکەدا هایدیگەر بوون بە(هێز) یان بە(نیشتمان) دادەنێت و هۆنراوەکەی(هۆلدەرلن)ی هۆنەری ئاڵمانی بەناوی"Home coming" بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم واتایە بەکار هێناوە .[32] بێگومان لێکدانەوەی واتای بوون وەکو(هێز)ێك، کە بەبەردەوامی هەوڵی خۆدەرخستن دەدات بیری بۆچوونەکەی (نیتشە)مان دەخاتەوە، کە (بوون) بە (ویست) لە پێناوی پەیداکردنی هێزدا Well to Power ناوزەدە دەکات. ئەوەی زیاتر کێشەکەمان لا ئاڵۆز دەکات لێکۆڵینەوەیەکی دیکەی هایدیگەرە لەمەڕ فینۆمینەو دیاردەی فینۆمینە.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا فینۆمینە، کە لە سەدەمی (کانت)ەوە بەدیاردە دانراوە، وادەردەکەوێت دیاردە نەبێتو بۆ خۆ وەدەرخستن پێویستی بەدیاردە هەبێت. ئەمەش لە میتافۆری نەخۆشیدا *Krankenheitserscheinungen* ڕوونکراوەتەوە.[33] بۆ نموونە نەخۆشی گرانەتا، فینۆمینەیەو بۆ ئەوەی

-[32] Martin Heidegger."Letter on humanism", in *Basic Writings*, David Farrell Krell(ed.) London: Routledge, 1996. P.220

-[33] Martin Heidegger. *Being and Time*, P.51

خۆی دەربخات پێویستی بە چەند دیاردەیەك (بەرز بوونەوەی پلەی گەرماو ئازاری لەش و کەم کردنەوەی خواردن) لە نەخۆشەکەدا دەبێت. ئەم دیاردانە نەخۆشیەکە(گرانەتا) نین. نەخۆشیەکە شتێکە بەرێگەی ئەم دیاردانە خۆی دەردەخات. بەم شێوەیە فینۆمینە بەدیاردەکان بوونی خۆی دەسەلمێنێت و خۆی دەردەخات و خۆی بە ئاگامەندی دەناسێنێت. پەیوەندی نێوان فینۆمینەو دیاردەی فینۆمینە زەرورییە. بەبێ دیاردە فینۆمینە خۆی دەرناخات و دیاردەش بەبێ فینۆمینە نابێت. بۆ ئەوەی فینۆمینە بناسرێت پێویستە دیاردەکان بدۆزینەوە. ئەم پەیوەندییە زەرورییە (کانت) لە پێش هایدیگەردا لە نێوان نۆمینەو فینۆمینەدا دایمەزراندووە، بەڵام هایدیگەر، وەکو کانت، باوەر بە نۆمینە ناکات و ئایدیالیستیانە نارِوانێتە کێشەکە. بۆ ئەو ئەوەی هەیە فینۆمینەو دیاردەکانی فینۆمینەیە، یان لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد(بوون)و(هەبوون)ەو ئۆنتۆلۆجیانە یەکیان گرتووە.فینۆمینە ڕاستیەقینەیەکی بەرزو دوور نیەو شتێکە هەیەو بۆ سەلماندنی بوونی پێویستی بە خۆ دەرخستن هەیە. بەم شێوەیە هایدیگەر فینۆمینە و بوونی بەیەك ڕاستی داناوەو لەیەکیان جیاناکاتەوە. هەندێکجار بوونێك ناناسرێت یان نادۆزرێتەوە، ئەو بوونە ڕاستیەکی بەرزو شاراوە، وەکو جیهانی ئایدیای ئەفلاتون و نۆمینەی کانت نیەو فینومینەیەکە هێشتا دیاردەکانی خۆی بۆ ئاگامەندی دەر نەخستوە یان دیاردەکانی ونبوون و ئەویش نێژراوەو ئیتر خۆی بۆ

ئاگامەندی دەرناخات. زۆر فینۆمینە هەن هێشتا نەناسراون و زۆریش هەن بۆ هەمیشە وونبوون و جارێکی دیکە پەیدا نابنەوە.  بوون یان فینۆمینە بەبەردەوامی خۆی دەردەخات و وونیش دەبێت. لەبەر ئەمەشە کۆکڵمانس و میشێل زیمەرمان بوونیان بە دینامیکی و پرۆسە داناوە. لە بەرهەمێکی دیکەی هایدیگەردا جارێکی دیکە (بوون) واتایەکی جیاوازی پێبەخشراوە.[34] لەم بەرهەمەدا هایدیگەر لەسەرەتاوە بەم پرسیارە "بۆچی بوون هەیەو نەبوون نیە؟" تویژینەوەکەی دەخاتەگەڕ. فەلسەفەش بە بیروڕای ئەم خۆی بە وەلامی ئەم پرسیارەوە ماندوو دەکات و لەسەدەمی یۆنانەوە فەیلەسوفەکان مامەڵەیان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا کردووە.

زاراوەی فیزیك *Physic*، کە لە یوونانیدا واتای (بوون) دەبەخشێت، بە هەڵە ڕۆمانیەکان گۆڕیویانە بۆ زاراوەی لاتینی (سروشت) *Natura* یان *Nature* و لەوکاتەوە بەم شێوەیە ناسراوە. ئەم هەڵەیە واتای تەواوی زاراوەکەو ناوەڕۆکی تویژینەوەی فەلسەفیانەشی گۆڕیوە بۆ باس و لێکۆڵینەوەی زانستیانە لەسەر سروشت و (بوون) خراوەتە پەراوێزەوەو لە

[34]- مەبەستم لەزنجیرەیەك لێکچەری هایدیگەرە لە زانکۆی فرایبۆرگ لە ساڵی 1935بەناوی "An Introduction to Metaphysic" پێشکەشی کردو بەم ناوەشەوە، وەکو پەڕتووك لە چاپدراوە.

بیر چۆتەوە.[35] ئایا ئەو بوونە لە بیرچووە چیە؟ چۆن بیناسین؟ چ جۆرە خسڵەتێکی هەیە؟ چ ناوەڕۆکێ بۆ ئاگامەندی دیاری دەکات؟ لە وەڵامدا؛ هیچ. بوون، کە لێرەدا باسیدەکەین مێزو کاغەزو فنجانی قاوەکەی بەردەمم و درەخت و ئوتۆمبیلەکانی دەرەوەی قاوەخانەکە نیە، من و کەسانی دەوروبەرم نیە و خسڵەتێکی دیاری کراوی نیە تاکو پێناسەی بکات. بوونی ئەو بۆ ئاگامەندی وەکو(هیچ)ە، بەڵێ (بوون)هیچە ئەستەمە بتوانین ئاماژە بە خسڵەتەکانی بکەین. ئەمەش کلۆڵی و دەستکورتی ئاگامەندی نیە، بەڵکو لەوەدایە، کە بوون هیچ خسڵەتێکی نیە تاکو ئاماژەی بۆ بکرێت، یان نیتشە گووتەنی؛ بوون هەڵمە.[36](هیچ)، لێرەدا، واتایەکی ڕەهای نیەو ئەوەش ناگەیەنێت بوونی ئێمە لەناو بۆشاییەکی بێ پانتاییدا دەسوڕێتەوە. هیچی بوون لە بێ خسڵەتیدایە. بوون هیچە یان شتێکە باسی ناکرێت و وەکو فینۆمینە بەهۆی دیاردەکانیەوە دەناسرێت. بوونی من یان قاوەخانەکەی تێیدا دانیشتووم بەڵگەن بۆ ئەو، چونکە بوون بناخەیە بۆ بوونی من و بابەتە هەبووەکان.

[35]- Martin Heidegger, *An Introduction to Metaphysics*, translated by Ralf Manheim, Haven: Yale University press, 1959. P.13

[36]- هەمان سەرچاوە لاپەڕە 36

ئاڵۆزی توێژینەوەکەی هایدیگەر لای سارتەر ئاوەڵا بۆتەوەو گرێکانی کراوەتەوەو ئەم زانایە هێندە خۆی بەکێشەکەوە ماندوو نەکردووە. بوونی مرۆڤ بۆ ئەم فەیلەسوفە لە هەموو کێشەیەکی فەلسەفی دیکە لە پێشترو گرنگتر خۆی دەرخستوە. لای سارتەر فینۆمینەو دیاردەی فینۆمینە بوون بە (بوونی فینومینە)و (فینۆمینەی بوون). ئەمیش، وەکو هایدیگەر، هەڵوێستە دووەلیستیەکەی (کانت)ی جێهێشتوە. بوونی فینۆمینە بناخەی فینۆمینەیەو فینۆمینەش دیاردەی بوونەو بەبێ ئەو نابێت. بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەشی نەخۆشەکە (لە میتافۆری نەخۆشیدا) بەبێ نەخۆشی (وەکو گرانەتا) ڕوونادات و بوونی بە نەخۆشیەکەوە گرێدراوە. ئەگەر (بوون)یش خۆی دەرنەخات و نەبێت بە فینۆمینە بە شاراوەیی دەمێنێتەوەو سەلماندنی دەبێتە گرفتێکی فەلسەفی لەچارەبەدەر.[37]

لەبەر ڕۆشنایی پەیوەندی زەروری لە نێوان بوونی فینۆمینەو فینۆمینەی بووندا خۆمان دەگەینەنینە ئاکامی ڕەتدانەوەی ڕاستی بەرزو (ترانسێدنتاڵ) دوور لە فینۆمینە. ئێمە جیهانێکی ئایدیای لە ئەستو بەدەر، وەکو جیهانی بەرزی ناو مێتافیزیکی ئەفلاتون و سەدەمی هۆشەکی و پڕنسیپاڵی یەکەمی ئەریستۆو (نۆمینە)ی کانت لەبەردەم

[37] Jean-Paul Sartre. *Being and Nothingness*, translated by Hazel E. Barnes, London: Routledge, 1972. P. xxv

خۆماندا قوتناکەینەوە. هەرچەندە بوونی فینۆمینە، وەکو فینۆمینەی بوون خسڵەتێکی دیارو هەستپێکراوی نیە هێشتا ئەو بوونە لە هەموو شتێك زیاتر لە ئێمەوە نزیکەو دووریشە.

تێگەیشتن لەواتای بوون کێشەیەکی هەرە گەورەی فەلسەفەیەو لە سەرەتاوە خۆی بەسەر توێژینەوە مێتافیزیکیەکەی ئەریستۆدا زاڵکردووە. هەوڵدانی ئەریستۆش بۆ گەیشتن و تێگەیشتنە زانیارییەکی تایبەت و شێوازێکی زانستی بەناوی (فەلسەفەی یەکەم)دامەزراندووە. ئەم سەرەتایە جێگاو کاریگەری خۆی لە مێژوووی گەشەکردنی بیروباوەڕی ئۆنتۆلۆجیدا تۆمارکردوە. بەڵام ئەریستۆ بواری بوونی لە سیستەمەکەیدا تەسك کردۆتەوەو لە ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتیەوە ڕوویکردۆتە ئۆنتۆلۆجی ناوچەگەری. (بوون) لە لای ئەم بووە بەجۆرێك لەبوون و جۆرێك ڕاستی یان پڕنسیپاڵی یەکەمەو لە جیهان دابڕاوەو لە ئەستو بەدەرە. لێرەدا ئەو پرسیارە خۆی دەسەپێنێت؛ ئایا ئەستو چۆن پەیدا بووە؟ ئەگەر ئەریستۆ گوتەنی ئەستو لەگەڵ پڕنسیپاڵی یەکەمدا هەمیشەیی بوو بێت و ئافەرید نەکراو بێت، خۆ دەبێ (بوون) وەکو بناخەیەکی لەپێشتر مەرجێکی ئۆنتۆلۆجی و لۆجیکیانە بێت بۆ پڕنسیپاڵی یەکەم و ئەستوی هەمیشە بوو. هیچ ڕاستیەکی لەپێشتر بەبێ (بوون) نیەو نابێت. لەم ناکۆکیانەوە لە سیستەمی مێتافیزیکی ئەریستۆدا خۆمان دەگەیەنینە

قۆناخێکی مێتافیزیکیانەی نوێتر. (بوون) بە ناوچەوە(وەکو سەدەمی هۆشەکی)گرێ نادەین. ئۆنتۆلۆجی ناوچەگەری لە بەشێکی بوون دەکۆڵێتەوەو بەشەکانی دیکە لە خۆی جیادەکاتەوەو ئاوەڕیان لێناداتەوە. وەکو ئەریستۆش توێژینەوەکەمان ناخەینە ژێر دەسەڵاتی زانستیانەوەو ئەپستمۆلۆجیەکی فەلسەفیانەی بەبەردا دەکەین. دەشێ زانست لەو سەدەمەدا بۆ ئەریستۆ واتایەکی جیاوازی هەبوو بێت، بەڵام بۆ ئێمەو سەدەمی تەکنۆلۆجیا زانست ڕێچکەی ئەزموونگەری گرتووەو خۆشی بە ئۆنتۆلۆجی ناوچەگەرییەوە ماندوو کردووە.

توێژینەوەی فەلسەفیانە ئەزموونگەری بە نەزۆك و بێ کەڵك دانانێت. بابەتی توێژینەوەی فەلسەفیانە (وەکو بوون) شتێك نیە ئەزموونگەری خۆی لە قەرەی بدات و دەستی بیگاتێ. توێژینەوەی فەلسەفیانە بو ئەم مەبەستە نا-زانستیانەیە. ئەمەش کەم کردنەوەی بەهای توێژینەوەی فەلسەفیانە نیە. تەنانەت زانستەکان، کە لافی ئەزموونگەری لێدەدەن، پشتیان بە هەندێك یاسای هەمەکیو لە ئەزموون بەدەر بەستوە. لە ئەپستمۆلۆجی ئەزموونگەریدا زانستەکان بناخەی لە ئەزموون بەدەریان هەیەو ناتوانن ئەو یاساو چەمکانەی مامەڵەی لە گەڵدا دەکەن زانستیانە بوونیان (بەئەزموون) بسەلمێنن. کەوتنی سێوەکە بۆ خوارەوە(نێوتن)ی گەیاندە باوەڕکردن بە یاسای ڕاکێشان، بەڵام نێوتن نەیتوانیوە(ڕاکێشان)

بخاتە بەر ڕۆشنایی ئەزموونەکانیو وەکو کەوتنی سێوەکە لە درەختەکەوە هەستەکیانە بیناسێت. یاسای ڕاکێشان هەمەکییەو لە ژوور ئەزموونی ئێمەو کەوتنەخواری سێوەکەدایە. ئایا نیۆتن لەو ئەزموونەیدا چی بینی؟ کەوتنەخوارەوەی سێوەکە یان ڕاکێشان؟ هەموو دەزانین نیۆتن سێوەکەو کەوتنی سێوەکەی بینیوەو لۆجیکمەندانەش گەیشتۆتە ئاکامی باوەڕ بە یاسای ڕاکێشان.

بوون فرە شێوازەو لە فۆرمی جۆراوجۆردا خۆی دەردەخات. هەرکام لە شێوازەکان خسڵەتی تایبەتمەندی خۆی هەیە. بوون، وەکو فینۆمینەیەکی سروشت لە فینۆمینەی جیهان و بوونی مرۆڤەوە جیاوازە. فینۆمینەی سروشت دیاردەیەکی ڕاستەوخۆیەو بوونی مرۆڤ تەنیا لە ڕوخاندنیا نەك لە بونیادنانیا بەشداری دەکات. دارستان بۆ نموونە فینۆمینەیەکی سروشتیە بەڵام مرۆڤ دەتوانێت درەختەکانی ببڕێ و مێزو کورسیو دەرگاو پەنجەرەیان لێدروست بکات و زەوییەکەشی بکات بە شوێنی ئارامگا بۆ خۆی. جیهان، لەم ڕووەوە، دەستکردی مرۆڤە. ئەو دیاردە گۆڕاوەی بوونە لە سروشتەوە بۆ جیهان و مرۆڤ بۆ مەبەستی خۆی دایهێناوە. قاوەخانەکەو شێوەی دانیشتن و خزمەتگوزاری ناو قاوەخانەکەو پارەدان و هاتووچۆی ئۆتومبیلی سەر شەقامەکەو جل وبەرگی خەلکی و شێوەی سڵاوکردنیان و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکدی و بەکارهێنانی زمان

و مۆسیقاو ڕەنگی کورسی و مێزو دیوارەکان و تابلۆی سەر دیوارەکان، ئەو جیهانە پێکهاتەیە مرۆڤ بۆ مەبەستی خۆی دایهێناوەو سروشت پەیدای نەکردوەو وەکو بوونی دارستانەکە ڕاستەوخۆ نیە. سروشت بە دارستان و شاخ و ڕوبارەوە هەیە بەڵام بەکورسی و مێزو ئوتومبیلەوە نیە. سروشت مرۆڤانە نیەو جیهان مرۆڤانەیە.

بەشی دووەم

# بوونی مرۆڤ

گرنگی توێژینەوەکەمان لە واتای بوون دەگەڕێتەوە بۆ جێگای (بوون) لە بیرکردنەوە فەلسەفیەکەماندا. بوون، وەکو بوونی فینۆمینە هەموو لایەکی داگیر کردووەو ئێمەش لە فینۆمینەی بوونەوە بە بوون ئاشنا دەبین. ئەمەش حوکم بەسەر ئەپسمۆلۆجی و میتۆدی توێژینەوەکەمان دەدات و ڕێگای گەشتەکەمان بۆ ڕۆشن دەکات. میتۆدێکیش لە بوونی فینۆمینە یان فینۆمینەی بوون بکۆڵێتەوە فینۆمینۆلۆجیانەیەو وەسفی فینۆمینەمان بۆ دەکات. لەلایەکی دیکەوە لەم گەشتە فەلسەفیەماندا هەموو فینۆمینەیەك ناکەین بەسەرەتاو خاڵی دەستپێکردنی گەشتەکەمان، لەو بوونەوە گەشتەکەمان دەخەینە گەڕ، کە لەهەموو هەبووەکانی دیکە لە پێشترو لە هەمان کات بنەڕەتیە. ئەو بوونەش، کە بەشێکی هەبووی وەکو درەخت و مێزو قاوەخانەکە دانانرێت، بوونی مرۆڤە. ئەو بوونەیە پرسیارە ئۆنتۆلۆجیەکە (ئایا واتای بوون چیە؟) لە بوونی دایەو هەموو توێژینەوەیەکی فەلسەفیانەش لەوەوە سەر هەڵدەدات. بێجگە لەمرۆڤ هیچی دیکە توانای پرسیارکردن و وەڵامدانەوەی نیەو تەنیا ئەو بەشوێن

واتای بووندا ویڵەو دەخوازێ لەبوونی خۆی و شتەکانی دەوروبەری تێبگات. ئەم هەڵوێستەش خسڵەتێکی تایبەتمەند بە مرۆڤ دەبەخشێو ئەم بوونەش بەبنەڕەتی لە سیستەمەئۆنتۆلۆجیەکەماندا دادەنێت. بنەڕەتی بوونی مرۆڤ بۆ ئێمە، کە لێکۆڵینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەش دەکات بە بنەڕەتی، لەوەوە نەهاتووە، کە بوونی مرۆڤ وەکو بوون بەگشتی بە بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی لە بنەڕەت بەدەر بۆ هەبووەکان دابنێت. ئێمەدەزانین بوونی مرۆڤ بە ڕێکەوت پەیدا بووەو ڕسکاوەو بەبێ (بوون) *Sein* ئەمیش نابێت و خۆی نەبووە بە بنەڕەت بۆ بوونی خۆی. بەڵام بنەڕەتی بوونیو شێوەی ئۆنتۆلۆجیەکەشی لە دوو خاڵدا کۆدەبێتەوە؛ یەکەم، مرۆڤ تاکە بوونێکە پرسیار لەواتای بوون دەکات و توێژینەوەی ئۆنتۆلۆجیانە دادەهێنێت. دووەمیش ئەگەر مرۆڤ نەبێت پرسیارە ئۆنتۆلۆجیەکەو توێژینەوەکەش نابێت. تێگەیشتن لە واتای بوونی مرۆڤ لە پەیڕەو کردنی میتۆدە فینۆمینۆلۆجیەکەمان زەرورەتی تەفسیرکردنی ئەو بوونە دەسەپێنێت و لەم حاڵەتەشدا میتۆدەکەمان بەتەنیا (وەسفی) نابێت و دەبێت لەسەر بناخەی تێگەیشتنەکەمان(تەفسیری) بوونی مرۆڤ بکات. ئەم کارەش پێویستی بە تێکهەڵکێش کردنی تەفسیرو میتۆدە فینۆمینۆلۆجیەکەمان دەبێت و میتۆدەکەمان بە تەنیا فینۆمینۆلۆجیانە نیەو دەبێت بە فینۆمینۆلۆجی هێرمینۆتیکی.[38]

---

[38]- Martin Heidegger. *Being and time*, P. 62

فینۆمینۆلۆجی پەیوەندی بە(فینۆمینەلیزم)ەوە نیە. ئەم میتۆدە هوسرڵ،[39] فەیلەسوف و هاو سەدەمی هایدیگەر دایمەزراندو کاریکردە سەر چەند بیریارو فەیلەسوفێکی سەدەمەکەش، یەکێك لەوانە هایدیگەر بوو. بەڵام هایدیگەر گۆڕانێکی گرنگی تێدا خولْقاندوەو هەوڵی داوە لەژێر کارتێکردنی بۆچوونەکانی ڕێنە دێکارت ڕزگاری بکات و زیاتر بە ڕاستەقینەی بابەتگەرییەوە بیبەستێتەوە. لەم ڕووەوە، میتۆدی فینۆمینۆلۆجی هایدیگەر ئەو دەسەڵاتە رەهایە بە ئاگامەندی نابەخشێت بە حەزو ئارەزووی خۆی مامەڵە لەگەڵ بابەتی بیرکردنەوە بکات و بیرکردنەوەش خسڵەتەکانی بابەتەکە ئافەرید ناکەن. ئاگامەندی فینۆمینەیەك بەوشێوەیە دەناسێت، کە خۆی بۆ ئاگامەندی دەردەخات. ئەمەش رەتدانەوەی ئەو بیروباوەڕە تازەگەرییەیە بابەت بە داهێنراوی ئاگامەندی دادەنێت و زانینیش بۆ ناو(زات) خۆ دەگەڕێنێتەوە. میتۆدی فینۆمینۆلۆجی ڕادیکاڵیانەیە؛ لەو دروشمەوە دەست پێدەکات، کە دەڵێت؛"هەموو بیرکردنەوەیەك بیرکردنەوەیە لەشتێکەوە." بیرکردنەوە بەتەنیاو بێ بابەتی دەرەکی نابێتو ئێمە ناتوانین بیر لە هیچ نەکەینەوە. ئەگەر

---

[39]- ئەدمۆند هوسرڵ(1859-1928) فەیلەسوفی ئاڵمانی لە ژێرکارتێکردنی فرانزبرینتانۆ (1828-1917) میتۆدی فینۆمینۆلۆجی دامەزراندوە. لە زانکۆکانی گۆتنگن و فرایبۆرگ مامۆستای فەلسەفە بووەو لە فرایبۆرگ ئاشنایەتی لەگەڵ هایدیگەر دەبەستێت کە ئەویش لەو زانکۆیە دەکرێت بەمامۆستا. کاتێك نازییەکان لەساڵی 1922 ئەڵمانیایان گرتە دەست، هوسرڵ لەبەر ئەوەی (جو) بوو لە زانکۆ دەرکرا.

بیرکردنەوە هەبێت، ئەوا بیرکردنەوەیە لە بابەتێکەوە، کە لەدەرەوەی بیرکردنەوەدا هەیەو خاوەنی ڕاستەقینەیەکی ئۆنتۆلۆجیە. ئەم کێشەیە لەخۆیدا بەڵگەیەکە بۆ سەلماندنی جیهانی دەرەوەی خۆو شێوەیەکی بابەتگەری‌و ڕیالیستانە بەسەر توێژینەوەکەماندا فەرز دەکات. لەم سەرەتایەشەوە خۆمان لە ڕاڕەوی گومانکاری دووردەخەینەوەو بوونی جیهانی دەرەوەی خۆ یان بیرکردنەوە بەڕاستەقینەیەکی ئۆنتۆلۆجی دادەنێین.

یەکێك لە پرنسیپاڵە هەرەگرنگەکانی میتۆدی فینۆمینۆلۆجی ڕەتدانەوەی هەموو پێشبیرو پێشبڕیارێکە لە دەستپێکردنی توێژینەوەکەیدا. بۆ ناسین و تێگەیشتن لەبوونی بابەتێك، فینۆمینۆلۆجی ڕاستەوخۆ بەرامبەر بابەتەکە ڕاماندەگرێت و داوامان لێدەکات خۆمان لەژێر کارتێکردنی پێشبیرو پێشبڕیارەکان لە بارەی ئەو بابەتەوە، کە لە پێش ئێمەدا پەیدا بوون، ڕزگار بکەین و لە کاتی مامەڵەکردنمان لەگەڵ بابەتەکەدا خۆمان بەوانەوە نەبەستینەوە. ئەم هەڵوێستەش لەوێدا ڕادیکاڵە، کە نایەوێت ئاگامەندی لە ژێر دەسەڵاتی بیردۆزو بڕیارو دۆگمایەکی لەپێشتر بیربکاتەوەو بابەتەکە هەڵسەنگێنێت. ئاگامەندی سەربەستانەو بەبێ دۆگمایەکی لەپێشترو ئامادەکراو هەوڵی تێگەیشتن لە بابەتەکە دەدات. لەسەرو ئەمانەشەوە پەنا ناباتە بەر تێگەیشتنێکی خۆگەری،

چونکە بابەتەکەی سەربەخۆیی ئۆنتۆلۆجی هەیەو خۆی بۆ ئاگامەندی دەردەخات و خۆ دەرخستنەکەش لەدەرەوەی بیرکردنەوەدایە. ئەپستمۆلۆجی، دیسانەوە لەسەر بنچینەی هاوکاری وپەیوەندی دیالێکتیکی لە نێوان ئاگامەندی و بابەتی دەرەکیدا دادەمەزرێتو هیچ لایەك لەم دوو لەیەنە ناکرێت بە قوربانی ئەویدی. خۆگەری رەوان یان بابەتگەری ڕەوان وەهمەو(زانین) هەڵقولاوی پەیوەندییەکانی نێوان خۆو بابەتە. ئاگامەندی لەسەر ئەو کێشەیەی دەڵێت "هەموو بیرکردنەوە یەك بیرکردنەوەیە لە شتێك" بەبێ بابەت زانین ئافەرید ناکات و بابەتیش بەبێ ئاگامەندی ناناسرێت و بەنەزانراوی دەمێنێتەوە. پرنسیپاڵەکانی میتۆدی فینۆمینۆلۆجی لە دوو پەڕتووکی هۆسرڵدا بە ئاشکرا پۆلین کراون.[40] بە ڕێگەی داماڵینی فینۆمینۆلۆجیانە لەدیاردەی بابەتەکەوە ئاگامەندی خۆی دەگەیەنێتە ناوەڕۆکیو بە حەدەس *Intuition* لایەنە شاراوەکەی دەدۆزێتەوەو لە بەشی شەشەمی*Logical Investigation* دا ئەم حەدەسەی ناوناوە حەدەسی کاتیگۆری *Categorical Intuition* . لەم خاڵەشدا پەیرەوی میتۆدەکەی هۆسرڵ دەکەین، بەڵام لەوێدا لێی جیا

---

[40]- بڕوانە:

Edmund Husserl.*The Shorter Logical Investigations*, translated by J. N. Findlay, London: Routledge, 2001, PP. 312-331

Edmund Husserl. *Ideas: General Introduction to Pure Phenomenology*, translated by W.R.Royce Gibson, New York: humanities Press. 1931.P.158

دەبینەوە، بۆ بەردەوام بوون و یەکگرتنی ڕووداو(حدس) ەکان باوەڕ بە دەسەڵاتێکی گیانەکی(خۆی ترانسێدنتاڵ) ناهێنین.[41]

بەبیری هوسرڵ ئەگەر خۆی ترانسێدنتاڵ *Transcendental Ego* نەبێت، زەمینەیەك بۆ خۆ نابێت تاکو هەموو ئەزموونە جۆربەجۆرەکانی لەسەر کۆبکاتەوەو هەموویان بە ئەزموونی یەك خۆوە گرێبدات. ڕابردوو و ئێستاو داهاتووش پێکەوە ببەستێت. هەر ئەم کێشەیەش بوو کەسانی وەك دێکارت و کانتی لە پێش هوسرڵدا گەیاندە باوەڕێکی ئایدیالیستیانە بۆ بوونی مرۆڤ و باوەڕیان بە بوونی ناوەڕۆکێکی(خۆ) نەگۆڕو بەردەوام لە بوونی مرۆڤدا هێنا. جیابوونەوەی ئێمە لە هوسرڵەوە لەسەر ئەم خاڵە پەیوەندی بە بۆچوونە ئۆنتۆلۆجیەکەمانەوە هەیەو لە دواییدا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

ئایا مەبەستمان لە هێرمینۆتیك چیە؟ پێش مامەڵەکردن لەگەڵ هێرمینۆتیکدا بەشێوەیەکی فەلسەفیانە پێویستە بزانین نەژادی ئەم زاراوەیە چیەو لە کوێوە هاتوە. هێرمینۆتیك زاراوەیەکی یۆنانیەو لە ناوی پەیامبەرێکە لە میتۆلۆجی یۆنانیەوە هاتووە *Hermes*.

---

[41] - Jean-Paul Sartre. *The Transcendence of the Ego*, translated by Forrest Williams and Robert Kirkpatrick, New York: Hill and Wang,1960.p.37

گوایە هێرمس یان ئەم پەیامبەرە گوتەکانی خوای بە گوێی کۆمەڵ گەیاندوەو بۆ خەڵکی شیکردونەتەوە.[42] هێرمینۆتیکیش واتای هونەر یا زانستی شیکردنەوە(تەفسیر کردن) دەبەخشێت. لەسەرەتاوە زانا خواناسەکان(ئایینیەکان) بۆ شیکردنەوەی دەقە ئایینیەکانیان بە کاریان هێناو لەسەر دەستی ئەوان بەتایبەت لە ئایینی مەسیحایەتیداو پاشان لە لای زانا موسڵمانەکان بایەخی پێدراوەو هەوڵدراوە لەم ڕێگایەوە لە دەقە ئاینیەکان بگەن.

لە ئایینی مەسیحیدا بەتایبەتی دوای سەرهەڵدانی بزوتنەوەی چاکسازی (ئیسلاحی ) پرۆتستانیزم بە ڕێبەری مارتن لوسەر(1483-1546)، هێرمینۆتیك بەرەو پێشەوە چوو. لای موسڵمانەکانیش بۆ شیکردنەوەی (قورئان)لە ئەلتەبەرییەوە بۆ زەمەخشەری و ئیبن عەرەبی و لە دواجاردا مەولانا ئازادو محەمەد عەبدە پرنسیپاڵی جۆراوجۆر دانراوەو هەر یەکێك لەم زانایانە پەیرەوی جۆرێك هێرمینۆتیکیان کردوەو شیکردنەوەکانیان بۆ ئایەتەکانی قورئان جیاوازن. ئەگەر زەمەخشەری لە ژێر کارتێکردنی بزوتنەوەی هۆشەکی موعتەزلە قورئانی شیکردبێتەوە ئەوا ئیبن عەرەبی پەنای بردۆتە بەر تێگەیشتنێکی سۆفیگەرانە. مەولانا ئازادو محەمەد عەبدەش وەکو دوو زانای لیبراڵی موسڵمان

---

[42]- بڕوانە: Robert Audi. *The Cambridge Dictionary of Philosophy*, Cambridge University Press, 1997. P.323

جاڕی چاکسازیان داوەو هەوڵیان داوە ئایەتەکانی قورئان لەبەر ڕۆشنایی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و مێژووی سەدەمەکەیان و هۆکارەکانی دابەزینیان شیبکەنەوە.[43] ئەم شێوە هێرمینۆتیکە(کە لە کەموکورتی بێبەش نیە) زۆربەی چاکسازیخوازەکان و هەندێك لە ژنانی موسڵمانیش بۆ چارەسەرکردنی کێشەی یەکسانی ژن و پیاو لە ئیسلامدا وەکو فاتیمەمەرنیسیو زەینە ئەنوەرو لەیلا ئەحمەد بەکاریانهێناوە.[44]

لەمێژووی فەلسەفەدا بۆ یەکەمجار فردریك شلایەرماخەر(1768-1824)، یەکێك لە زانایانی پاش کانت هەوڵی دامەزراندنی هێرمینۆتیکی فەلسەفیانە داوەو ویستویەتی ئەم هونەرە نەك تەنیا بۆ دەقە ئاینیەکان، بەڵکو بۆ خوێندنەوەی هەموو جۆرە دەقێك یا نوسراوێك بڕەخسێنیو دەستەیەك خەسڵەتی بۆ ئاماژە بکات. بە بۆچوونی ئەم زانایە هێرمینۆتیك هەوڵدانێکی (خۆ)ییـیە بۆ تێگەیشتن لە دەق و پەیوەندیەکی پتەویشی بە بابەتی زمانەوە هەیە، چونکە هێرمینۆتیك بەبێ بەکار هێنانی زمان مەحاڵەو زمانیش سیستەمێکی دەرەکیو ئامادەکراوە، کە کەسێك بۆ شیکردنەوەی دەقێك کەڵکی لێ وەردەگرێت.

---

[43]- بڕوانە پێشەکی تەفسیری(المنار)ی محەمەد عەبدە، کە ڕەشید ڕەزای شاگردی لە بەرگی یەکەمی ئەم پەڕتووکەدا ئامادەی کردووەو هەروەها مەولانا ئازاد(زانای موسڵمانی هێندی)لە (ترجمان القران)دا پەیڕەوی هەمان بۆچوونی کردووە.

[44]- زەینە ئەنوەر سەرۆکی ڕێکخراوی(خوشکانی موسوڵمان)ە لەمالیزیاو لەو باوەڕەدایە، قورئان باسی یەکسانی ژن و پیاو دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی پیاو شی(تەفسیری)کردۆتەوە ئەم لایەنە باسنەکراوە.

بۆنموونە پەیڕەوکردنی ڕێزمان(Grammar). بەڵام، لەهەمان کاتدا شیکردنەوە شوێنکەوتنی دەستورەکانی ڕێزمان نیە، نوسەر یان خوێنەر شێوازی داڕشتن و بیرکردنەوەی خۆی هەیە، کە خۆی دیئافرێنێ.[45]
دوای شلایەرماخەر دیڵتی(1833-1911)، زانایەکی دیکەی ئاڵمان، هەوڵی پێشخستنی هونەری هێرمینۆتیکی‌دا. بیروڕاکانی دیڵتی لەم ڕووەوە پەیوەندییان بە دوو خاڵەوە هەیە؛ یەکەم داڕژانی سنورێکی ئەستوور لە نێوان زانستە سروشتیەکان و کۆمەڵایەتیەکانداو دووەم، واتای (تێگەییشتن)و ئەزموونی ژیان *Erlebins*. بەپێچەوانەی (کانت)ەوە ئەم زانایە تێگەیشتنی نەکرد بە بەشێکی هۆشی مرۆڤ، کە زەخیرەیەکی ئامادەکراوو لە پێشتری کاتیگۆرییەکانی لەنێو خۆیدا هەڵگرتبێت، بەڵکو لای ئەو ڕووداوەو پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەبابەتەکەیەوە هەیەو زۆر جاریش ئەم دوو زاراوەیە (تێگەیشتن) و (ئەزموونی ژیان) وەکو یەك هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کراوەو بە یەك شت دانراون. لە جیاکردنەوەی زانستە سروشتیەکان لە کۆمەڵایەتیەکانەوە ، دیڵتی گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی ئەم دوو زانستانە دوو جۆر ئەپستمۆلۆجی پێکدەهێنن. ئەپستمۆلۆجی زانستە سروشتیەکان لەسەر (شەرح)ی فینۆمینەکان و بەستنەوەی ئاکام بە هۆکارەکانیانەوە ڕادەوەستێت زانستە کۆمەڵایەتیەکانیش دەبن بە بابەتی ئاگامەندی یان ئەزموونی ژیان و

---
[45] Richard N. Longencker. *Biblical Exegesis in the Apostolic Period*, Eerdmans, 1975 . P.19

ئەپستمۆلۆجیەکی تایبەتیان هەیە.[46] لێرداو لەم گۆشە نیگایەوە هێرمینۆتیك تێگەیشتنە لە ژیان و دەربڕینی ئەزموونی ژیان لە فۆڕمی نوسینداو خوێنەریش بە خوێندنەوەی نوسین یان دەق دەتوانێ بچێتە ناو بیرکردنەوەی نوسەرەکەو لە کەسایەتی ئەو بگات. تێگەیشتنمان لە دەقیش لە ناو بازنەی هێرمینۆتیکیدا لە بەشێکی دەقەوە بۆ دەق بەگشتی دەسوڕێتەوە. بۆ تێگەیشتن لە دەقێك پێویستە لە بەشەکانیەوە دەست پێبکەین و تێگەیشتنمان لە بەشەکانی بەبێ تێگەیشتن لەدەقەکە بەگشتیش مەحاڵە.[47] جیاوازیەکانی نێوان بیروباوەڕی شلایەرماخەرو دیلتی لەوێدا سەرهەڵدەدەن، یەکەمیان هەوڵی نەداوە ئاوڕ لە گرنگی مێژوو بۆ تێگەیشتنی دەقێك بداتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی تێگەیشتن ئەزموونی ژیانەو هەموو ئەزموونێك ڕوداوێکی ناو مێژووە ئەوا تێگەیشتنی ئێمە بۆ دەقێك پێویستە لە ڕووداوە مێژووییەکەی جیانەکرێتەوەو دەقەکەش لە ناو مێژوودا دەر نەهێنرێت و بەچاوی ئەمڕۆ تەماشای ڕابردوو نەکرێت، چونکە هەموو دەقێك هەڵقوڵاوی سەدەمەکەی خۆیەتی. ئێمە لە باسی خسڵەتەکانی میتۆدی فینۆمینۆلۆجیدا جەختمان لەسەر کێشەی ڕەت دانەوەی پێشبیرو پێشبڕیارەکان کرد. ئەمەش بەپێچەوانەی هێرمینۆتیکی (دیلتی)یەوە، کە هەموو دەقێك

---

[46]- Rudolf Makkrell. *Dilthy: Philosophy of the Human Studies*, Princeton University Press, 1975. P.248

[47]- Wilhelm Dilthy. *"The Development of Hermeneutics"*, in *W.Dilthy's Selected Writings*, H. P. Richman (ed.), Cambridge University Press, 1976 . P. 258

دەخاتە نێو مێژووەوە و گوایە بەبێ تێگەیشتن لەسەدەمەکەی بە تەواوی واتاکانی دەق خۆیان دەرناخەن، فینۆمینۆلۆجی، وەك میتۆدێکی دابڕاو لەمێژوو خۆی نیشاندەدات. ئایا ئێمە دەتوانین بەیەکجاری پێشبیرو پێشبڕیارەکان ڕەتبدەینەوەو بۆ تێگەیشتن لە بابەتێك خۆمان بە هیچەوە نەبەستینەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لای هوسرڵ و شاگردەکانی پۆزەتیڤەو بەتەنیا لەو ڕێگەیەشەوە ئاگامەندی دەتوانێت ڕاستەوخۆ خۆیبگەیەنێتە ناوەڕۆکی بابەتەکەی. کێشەی ڕەتدانەوەی پێشبیرو پێشبڕیارەکان لە فینۆمینۆلۆجی هوسرڵدا پەیوەندی بە ڕێچکە گومانکارییەکەو بۆچونەکانی (دێکارت)ەوە هەیەو (هوسرڵ)یش بە یەکێك لەو فەیلەسوفانە دادەنرێت کە لەژێر کارتێکردنی دێکارتدا فەلسەفەکەی خۆی داڕشتوە. بەڵگەشمان بۆ ئەم کارتێکردنە ئەم کێشەیەو کێشەی بڕواکردنە بە خۆیەکیبەرز لە ژوور تاقیکردنەوەکانی ڕۆژانەی مرۆڤەوە. دێکارت لەسەرەتاوە بۆ دامەزراندنی فەلسەفەکەی گومان لە هەمووشتێك دەکات و خۆی لە هەموو دوگمایەك ڕزگار دەکات و وێستگەیەکی نوێ بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت، کە تەنیا بوونی خۆی دەبێت بە ڕاستیەکی بەڵگەنەویست و لە گومانبەدەر. لەمیتۆدی هوسرڵدا بە هەمان شێوە هەڵوێستی ئاگامەندی لە ئاستی بابەتەکەیدا نوێیەو هیچ باوەڕو بیردۆزێکی لەپێشتری بە خۆوە نەگرتووە. با ئەوەشمان لە بیر نەچێت

هوسرڵ، وەکو دێکارت گومان لە ڕاستی پێشبیرو پێشبڕیارەکان ناکات و بەڵکو بە پێویستیان دانانێت.

وەڵامی پرسیارەکەی پێشو لای هوسرڵ و شاگردەکانی پۆزەتیڤ بوو لای ئێمە نێگەتیڤەو باوەڕمان بە ڕەتدانەوەیەکی ڕەهای پێشبیرو پێشبڕیار نیەو ئاگامەندی ناتوانێ بۆ ناسینی بابەتەکەی هیچ بەستێنێکی لە پێشتری نەبێت. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خسڵەتی مێژوویی ئاگامەندیی و بابەتی ئاگامەندی، کە هەرگیز لێك دانابڕێن. ئاگامەندی لە هەر گۆشەنیگایەکەوە بڕوانێتە بابەتەکەو هەوڵی تێگەیشتن بدات ئەو هەڵوێستەی لەنێو مێژوودایەو بابەتەکەش بە هەمان شێوە بەرهەمی سەدەمەکەیەتی. هایدیگەر یەکەم فەیلەسوفە پاش هوسرڵ کوێرانە شوێن میتۆدی فینۆمینۆلۆجی نەکەوتبێ‌و هەوڵی گۆڕانکاری دابێتو هێرمینۆتیکێکی نوێی بۆ ئامادە کردبین.[48] هێرمینۆتیکی هایدیگەریش بەم خاڵانەدا دەناسرێنەوە:

یەکەم: میتۆدی فینۆمینۆلۆجی دەتوانێت خۆی لە پێشبیرو پێشبڕیارەکان دوور بخاتەوە بەڵام ئاگامەندی هەمیشە بۆ ناسینی بابەتەکەی پێویستی بە سترەکچەرێکی لە پێشتر هەیە.

[48] - Martin Heidegger. *Being and Time*, P.79

دووەم: هایدیگەر وەکو دیڵتی هێرمینۆتیك بە هونەری شیکردنەوە (تەفسیرکردن)ی بوونی مرۆڤ دادەنێت.
سێیەم: تێگەیشتن بەشێکی هۆشی مرۆڤ نیە(وەکو کانت دەڵێت) بەڵکو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ.
چوارەم: تێگەیشتن پێش شیکردنەوە دەکەوێت.
پێنجەم: هێرمینۆتیك بەتەنیا هونەری تێگەیشتن لە دەق و شیکردنەوەی نیە، هونەرێکە دەتوانین بۆ تێگەیشتن و شیکردنەوەی واتای بوون بەکاری بهێنین.
شەشەم: جوڵانی بازنەی هێرمینۆتیکی، لەم ڕووەوە، لە بوونی مرۆڤەوە بۆ بوون بەگشتیو لێرەشەوە بۆ بوونی مرۆڤە.

شیکردنەوە هەوڵدانی دەرخستنی ڕاستیەکە، کە لەسەر (تێگەیشتن) لەو بابەتە ڕادوەستێت. بەبێ تێگەیشتن شیکردنەوە نیەو نابێت و بێتێگەیشتن ناتوانرێت شیبکرێتەوەو تێگەیشتن لەم حاڵەتەدا پێشمەرجە بۆی. بەڵام بۆچی دەمانەوێ شیکردنەوە ئەنجام بدەین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئاماژەی سترکچەرێکی لە پێشتر بۆ شیکردنەوە دەکات و زەمینەی بۆ خۆش دەکات. پێش هەمووشتێك تێگەیشتن بە پێشمەرج بۆ شیکردنەوە خۆی هێنایە پێشەوەو لەم بۆچوونەشەوە دەتوانین بڵێین شیکردنەوە لە ناو

(

تێگەیشتندا سەر هەڵدەدات،[49] هەروەها پرۆژەی تەفسیر داوای بەکارهێنانی زمان دەکات و زمانیش سیستەمێکی لە پێشتر ئامادەکراوە. دەتوانرێت لە تەفسیردا زاراوەی نوێ دابتاشرێ بەڵام سەقامکردنیان لە چوارچێوەی سترەکچەری زمانە دامەزراوەکەدا دەرناچن.

پێشمەرج بۆ تەفسیر چەقین و خۆبەستنەوە بە پێشبڕیارو پێشبیرەوە نیە. ئەم سترەکچەرە لە پێشترەی بۆ تەفسیری دادەنێین سێ کۆڵەکەی لەسەر داکوتراوە؛ پلانی لە پێشتر*Vorhabe* و مەبەستی لە پێشترو *Vorsicht* چەمکی لەپێشتر *Vorgriff*.[50]ئەم سێ کۆڵەکەیە وەڵامی پرسیارەکەی پێشومان بۆ مسۆگەر دەکەن و هەموو تەفسیرکردنێك بە خۆیانەوە دەبەستن و سترەکچەرێکی لە پێشتری پێدەدەن.

داڕشتنی ڕەنگی بناخەی تەفسیر لەسەر زەمینی تێگەیشتن بایەخدانێکی فەلسەفیانەیە بەواتای ڕایەڵەی(تێگەیشتن)مان لە بوون. تێگەیشتن، ئەگەر بەم جۆرە هەڵسەنگێندرێت نابێت بە نهۆمێکی ناو

---

[49]- هانس جۆرج گادەمەر Hans-George Gadamer یەکێکە لە شاگردەکانی مارتن هایدیگەر، پێشخستنی تێگەیشتن لە شیکردنەوەدا(تەفسیر کردندا) بە گرنگ دادەنێت و ئەمەش لە خۆیدا دوورە پەرێزی‌یە لە فینۆمینۆلۆجی (هوسرڵ)ەوە، بڕوانە:

Hans-George Gadamer *Truth and Mathod*, translated by William Glen Doepel, London: Sheeal and ward,1979.P. 258

[50]- بۆ گۆڕینی ئەم زاراوەیەی مارتن هایدیگەر بۆ کوردی بەگوێرەی واتاکەی یان ناوەڕۆکی مامەڵەم لەگەڵیدا کردووە. هایدیگەر واتایVorsicht بە (مەبەست) لە ئەنجامدانی پرۆژەی تەفسیردا دادەنێ. دەشێ ئەم سێ زاراوەیە بە(پلان ، مەبەست و چەمکی لە پێشتر) لێکبدرێنەوە. بڕوانە: Martin Heidegger. Op. cit., P.192

هۆش، بەڵکو وەکو هایدیگەر ڕوونی دەکاتەوە دەبێت بەپێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ و مسۆگەرکردنی ڕەسەنیەتی ئەم بوونە. مرۆڤ، بە پێچەوانەی هەبووەکانەوە، بەتێگەیشتنەوەو تێگەیشتوانە دەڕوانێتە بوون. بە تێگەیشتنەوە بڕیار لەسەر داهێنانی پڕۆژەکانی دەدات. داهێنانی پرۆژە، لەم گۆشە نیگایەوە تێگەیشتنە لەبوون و تێگەیشتنی بوونیش داهێنانی پڕۆژەیە.

بابەتی تەفسیرەکەمان لەم پڕۆژە فەلسەفیەدا دەقێکی نوسراو نیەو بوونێکە لەبەر ئەوەی دەسەلاتی پرسیار کردن و تێگەیشتنی هەیە خۆی بەسەر توێژینەوەکەماندا فەرز کردوەو خۆی کردووە بە یەکەم بابەت و سەرەتای خولەی بازنە هێرمینۆتیکی‌یەکەمان. توێژینەوەکەمان لە تێگەیشتن لەم بوونەو تەفسیرکردنی واتای بوونیەوە دەست پێدەکات و خۆی دەگەیەنێتە قۆناخەکانی دیکەو لە پەنجەرەی ئەم تێگەیشتنەشەوە لە واتای (بوون) بە گشتی دەکۆڵێتەوە. لەبەر ئەوەی تەفسیرەکەمان فینۆمینۆلۆجیانەشە خۆمان بە بیردۆزەو پێشبیرەکانەوە مادووناکەین و لە ئاستی بابەتی لێکۆڵینەوەکەماندا (ڕاستەوخۆ) دەوەستین و بەو جۆرەی بابەتەکە خۆی بۆ ئێمە دەردەخات هەوڵی ناسینی دەدەین. ئەم هەڵوێستە فینۆمینۆلۆجیانە هوسرلانە نیەو لە پەیرەویکردنی فینۆمینۆلۆجی-

هێرمینۆتیکی هایدیگەردا حاشا لەگرنگی و ڕۆڵی سترەکچەرە لەپێشترە سێکۆڵەکیەکە ناکات.

بابەتی تەفسیرکراو، لێرەدا، بوونی مرۆڤە، کە مێژوویی‌یەو (کات)و(گۆڕانکارییەکان) حوکم بەسەریدا دەدەن. تەفسیرکەریش دەسەڵاتێکی بەرزو دەرەکی نیەو مرۆڤ خۆیەتی. تەفسیرەکەمان بەم شێوەیە نوسینەوەی داستانی بوونی مرۆڤە بە قەڵەمی خۆیو لەسەر تێگەیشتنی خۆی. هەرسێ کۆڵەکەکانی هێرمینۆتیك؛ (تەفسیرکراو)و(تەفسیرکەر)و(تەفسیرکردن) دینامیکیەت وەردەگرن و تەفسیرکردن دەکەن بە ڕووداوێکی مێژوویی و قۆناخگەری و ئەو ڕاستیەمان پێرادەگەیەنن، کە تەفسیرەکەمان دوا تەفسیرو نەگۆڕو ڕەها نیەو بەستراوە بە قۆناخە مێژووییەکەیەوە. تێگەیشتنمان لەواتای بوون دەبێت بە فەلسەفەی سەدەمەکەی خۆی و توێژینەوەیەکی مێژوویی نەك ڕاستیەکی بەرزو لە مێژوو بەدەرو هەمیشە نەگۆڕ.

بوونی مرۆڤ لە هەموو شێوازە بوونێکی دیکەوە جیاوازەو تایبەتمەندە. بوونێکە ناتوانین بڵێین هەبووەو لە ڕیزی شتە هەبووەکان، وەکو مێزو درەخت و ئەسپ داینێین. بوونێکە ناتەواو و ئاگامەندانە هەوڵی تەواو بوون دەدات و پڕۆژەکان بە ئەنجام دەگەیەنێت. تایبەتمەندیەتی ئەم بوونە ڕێگەمان نادات لە تەفسیر کردنیداو بۆ تێگەیشتن لە بوونی ئەو

کاتیگۆریانە بەکاربهێنین، کە بۆ ناسینی هەبوویەك دەخرێنەگەڕ. ئەو زمانە فەلسەفیەی تەفسیری ئەم بوونەی پێدەکرێت پێویستە جیاواز بێت و کاتیگۆریەکانی لۆجیکی ئەریستۆی بەسەردا ناچەسپێت.[51] داهێنانی زمانێکی نوێی فەلسەفیانە، بێگومان کێشەیەکی ئاسان نیە، یان دەشێت هەندێك ئەو پرسیارەمان ئاراستە بکات، بۆچی زمانێکی فەلسەفی نوێ بۆ تەفسیرکردنی بوونی ئەم بابەتە پێویستە؟ لە وەڵامدا دەڵێم چۆنیەتی ئەم بوونە ئەو زمانەمان بەسەردا دەسەپێنێ. کاتیگۆرییەکانی ئەریستۆ، کە دەبن بە(بار) بۆ بارهەڵگرەکە لەوێدا لە ئاستی تەفسیرکردنی ئەم بوونەدا لاواز دەبن، کە خۆیان بەبێ جیاوازی کردن لەنێوان بوون و هەبوودا ، بەسەر هەموو شتێکدا دەسەپێنن. ئێمەش یەکەم کەس نین بەم جۆرە ڕەخنەمان لە ئەریستۆ گرتبێت. پێش ئێمە هەندێك زانای دیکە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش ئاماژەیان بەم کێشەیە کردووە. کانت یەکێکە لەوانەی گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کاتیگۆریەکان بەتەنیا بەسەر فینۆمینەدا ساخ دەبنەوەو ئەگەر بوونێك لە ژوور فینۆمینەوە هەبێت ڕۆشنایی کاتیگۆریەکانی پێناگات و نابێت بەبار هەڵگر، لەبەر ئەمە بە

---

[51]- بۆ یەکەم جار ئەریستۆ ناوی دە کاتیگۆری بردووە، یەکەمیان ناوەڕۆکەو لە هەمویان بەرزترە چونکە ناوەڕۆك تاکەکاتیگۆریە نابێت بە بارو خۆی بار هەڵگرەو کاتیگۆریەکانی دیکە(چەندیەت، چۆنیەت، پەیوەندی، کات، شوێن، دۆخ، حاڵەت، کردارو کارتێکردن)دەبن بە بار Predicate یان خسڵەتی ئەو. کانت لە لێکۆڵینەوە ئەپستمۆلۆجیەکەیدا کاتیگۆریەکان بە زەرورەیەکی خۆیی لەنێو هۆشی مرۆڤدا بۆ تێگەیشتن دادەنێت و گوایە بەبێ ئەم کاتیگۆرییانە وەکو پێشمەرجی زەروری بۆ تێگەیشتنی بیرەکان سەبارەت بە بابەتە دەرەکیەکانەوە پەیدا نابن. بڕوانە: Immanuel Kant. Op. cit., A:80, B:106

نەزانراوی دەمێنێتەوە. ئیبن تەیمییە(1263-1328)ش لە ڕەخنەکانیدا لەسەر بیرکردنەوەی هۆشەکی لای فەلسەفە موسوڵمانەکان گەیشتۆتە هەمان باوەڕو (خوا)لە ناو بازنەی توێژینەوەی لۆجیکمەندانە دەردەهێنێت. ئێمەش وەکو ئەم زانایانە خۆمان گەیاندۆتە ئاکامێکی نەرێی و ئەم بوونە ناکەین بەبار هەڵگر یان هەڵگری کاتیگۆرییەکان. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی بوونی ئەم لەگەڵ هەبووەکان. ئایا ئەم ئاکامە نەرێی‌یە ئەوە دەگەیەنێت ئەم بوونەش، وەکو نۆمینەی کانت و خواکەی ئیبن تەیمییە بەنەزانراوی بمێنێتەوە؟ ئێمە چۆن بتوانین لە بوونی بگەین؟ بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان دیسانەوە دەگەڕێینەوە بۆ میتۆدەکەمان، میتۆدی فینۆمینۆلۆجی هێرمینۆتیکی و لە سەرەتاشەوە ئەو خاڵە دیاری دەکەین، کە نەزانراوی بوونی مرۆڤ لەوەدا نیە نەتوانین کاتیگۆریەکانی بۆ بکەین بەبار، بەڵکو نەزانینێکی کاتی و میتۆدییەو تاکو ئەو کاتە هەناسە دەدات، کە ئەو بوونە خۆی دەردەخات و بەو میتۆدە لە بوونی خۆی دەگات و تەفسیری دەکات. بەڵام لە تەفسیرەکەیدا کاتیگۆریەکان بە کار ناهێنێت و پەنا دەباتە بەر داهێنانی زمانێکی فەلسەفیانەو زاراوەو چەمکی نوێ بۆ تەفسیرکردنی بوونی خۆی. داهێنانی زمانێکی نوێ کارێکی گونجاوە. ئەوانەی زانستە سروشتیەکان و کۆمەڵایەتیەکان لە یەکدی جیادەکەنەوە لەو باوەڕەدان زمانی زانستێکی سروشتی(بۆ نموونە فیزیا) لە زمانی زانستێکی

کۆمەڵایەتیەوە(بۆ نموونە سایکۆلۆجی) دوورە. ئەم جیاوازییەش بەستراوەتەوە بەچۆنیەتی لێکۆڵینەوەکەیان. ئەمەش بە پێچەوانەی بوچوونەکانی بیریارە مارکسیستەکان و شوێنکەوتوانی بازنەی(ڤیەنا) یان لۆجیکی پۆزەتیڤی، کە زانستە سروشتیەکان و کۆمەڵایەتیەکانیان لە یەکدی جیاناکەنەوە لەو باوەڕەدان کۆمەڵیش لەبەر ڕۆشنایی یاسا سروشتیەکاندا باشتر دەناسرێت چونکە هەردوو بابەتی لێکۆڵینەوەکە(سروشت و کۆمەڵ) سەربەیەك چاوگی مێتافیزیکین.[52] بۆ ئێمە مرۆڤ بوونە و نەك هەبوو. ناوەڕۆکی هەبوویەك(وەکو مێز) نەگۆڕو لە پێشترە. مێز بوونێکی پڕی هەیەو لەوە زیاتر بە هیچی دیکە نابێت. پێش دروستکردنی مێزەکەش ناوەڕۆکی مێزەکە یان چیەتی مێزەکە لە ناوبیری دروستکەرەکەیدا بوەو پێش دروستکردنی ئەو زانیویەتی مێز چیەو بۆ چیە. بوونی مرۆڤ ناوەڕۆکی نەگۆڕو لە پێشتری نیە. نازانرێت ئەو مرۆڤە چیەو دەبێت بە چی تاکو پەیدا نەبێت، کە پەیداش بوو لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکێکی لەپێشتری پێنەدراوە بە ناتەواوی و بێ ناوەڕۆك پەیدا دەبێت. بوونی پێش ناوەڕۆکی دەکەوێت و ناوەڕۆکیشی ئەو

---

[52]- لەناو مارکسیستەکاندا فردریك ئینگڵز(1820-1895) شوێنکەوتووی توندڕێی ئەم بیروباوەڕەیەو هەوڵی داوە کاڵایەکی زانستیانە بە بەر فەلسەفەی مارکسدا بکات. هەروەها کارڵ کاوتسکی(1854-1928)زانایەکی دیکەی مارکسیست هەوڵیداوە زانستیانە بڕوانێتە فەلسەفەی مارکسیزم و داریونیزم و مارکسیزمی تێکهەڵکێش کردووە. بەڵام لە ساڵی 1885وە کاوتسکی یەکگرتنی زانستە سروشتیەکان و کۆمەڵایەتیەکانی ڕەتکردەوە. بڕوانە:
Gary P. Steenson. *Karl kautsky,1854-1938*, Pittsburgh, University of Pittsburgh Press, 1991. P.5

پرۆژانەیە خۆی بڕیار لەسەریان دەدات. ئەم توێژینەوەیە، وەکو پێگەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ تێگەیشتنمان لەم بوونە ئەو خاڵەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە بۆچی ئێمە ئەم بوونەمان بە هەبوو دانەناوە. ناوەڕۆکی مرۆڤ لە بوونیدایە، ئەو هەتاکو نەبێت ناوەڕۆکیشی نابێت. ناوەڕۆکیش خسڵەتێکی نەگۆڕو چەسپاو بە بوونیەوە نیە، داهێنانێکی بەردەوام و تراجیدیە بەرەو تەواوکۆیی.

بۆ تێگەیشتنی نوێ لەم بوونە دێکارت هەنگاوێکی گەورەی ناوەو بەنیازی داهێنانی سەرەتایەکی نوێ بۆ فەلسەفەکەی بۆچوونەکانی ئەریستۆی ڕەتدایەوەو لە پێگەیەکی بەڵگەنەویستی نوێوە قۆڵی لێ‌هەڵماڵیوە. بەڵام هێشتا بۆچوونە نوێکەی دێکارت بە بیروباوەڕی ئێمە لەکەمو کورتی بەدەر نیەو دیسانەوە کاتیگۆریەکانی ئەریستۆی بۆ فەلسەفە نوێکەی بەکارهێناوەو نەیتوانیوە زمانی فەلسەفی خۆی بگۆڕێت. (کانت)یش ویستویەتی دێکارت ڕەتبکاتەوە، بەڵام لەسەر زەمینە دێکارتیەکە ماوەتەوەو شۆڕشێکی ڕادیکاڵانەی بەسەردا نەکردووە. بە بیروڕای گلبرت ڕایڵ دێکارت لە تەفسیرکردنی واتای ئەم بوونەدا خۆی تووشی هەڵەی کاتیگۆری کردووە Category mistake. ئەمەش بە بۆچوونی من پەیوەندی بە کاریگەری ئەریستۆ بەسەر بیرو باوەڕی

دێکارتەوە هەیە.[53] دروستە دێکارت خاوەنی پێگەیەکی نوێیەو بوونی مرۆڤی کردووە بەسەرەتا بۆ توێژینەوە فەلسەفیەکەی، بەڵام ئاکامە فەلسەفیەکانی لە ڕێگایەکی دیکەوە بەو شوێنە دەگەن ئەریستۆ دەستنیشانی کردوون. لەبەر ئەمە، بۆ ئێمە گۆڕانکارییەکانی ناو فەلسەفەی دێکارت ڕادیکاڵ نین. دێکارت بانگەشەی فەلسەفەیەکی نوێمان بۆ دەکات، کەچی لە ئەنجامدا ئەوەی باسی دەکات بونیادێکی ئۆنتۆلۆجی ئایدیالیستیانەی هەیەو لەگەڵ بۆ چوونەکانی ئەریستۆدا یەکدەگرنەوە. (کانت)یش بە هەمان شێوە گەڕاوەتەوە سەر هەمان ڕێگەو هەمان گۆشەنیگاو تەنیا جیاوازیەك لە نێوان دێکارت و کانتدا هەبێت ئەوەیە، کە کانت پەیڕەوی ڕێچکەی نازانمکاری کردووەو ناکۆکیەکی گەورەی لەبەر دەم خۆیدا قوت کردۆتەوە. لە لایەکەوە ئەپستمۆلۆجیەکەی خۆی ناگەیەنێتە ئەودیو سنووری فینۆمینەو لە لایەکی دیکەوە بەبێ ئەوەی بزانێت باوەڕی بە بوونی ناوەڕۆکێکی لە ئەستوبەدەر لە بوونی مرۆڤدا هێناوە. ئێمە لەو خاڵەدا لەگەڵ دێکارت هاودەنگین، کە بوونی مرۆڤ دەکات بە پێگەیەکی بەڵگەنەویست و سەرەتای گەشتەکەی. هۆکاری ئەم بڕیارانەش بۆ دێکارت ئەپستمۆلۆجیانەیەو بەستراوە بەچۆنیەتی ناسینی ئەم بوونەوە، کە لە هەمووشتێك زیاتر ئێمە دەیناسین و دەزانین هەیە. لەگەڵ ئەو بۆچوونەشداین دێکارت لە جیاکردنەوەی

[53]- بۆ لێکۆڵینەوەکەی گلبرت ڕایڵ بڕوانە: Gilbert Ryle. *The Concept of Mind*, New York: Penguine Books, 1980. P.20

بوونی مرۆڤ لە هەبووەکانەوە(ئاگامەندی) دەکات بە شورایەکی ئەستوورو بە بنەڕەتی ئەم بوونەی دادەنێت؛ " دڵنیام لەوەی من هەم. تاکو کەی؟ تاکو ئەوکاتەی بیرکردنەوەم (*Cogito*) دەوەستێت... من بوونێکی ئاگامەندم؛ ئاگامەندیش هۆشە، دەروونە(*Animus*)، کە من لەوەوپێش نەمدەناسی. من ڕاستەقینەیەکم هەیە، بەڵام چ جۆرە بوونێك؟ بوونێکی ئاگامەند(*Cogitans*)."[54]

خوێندنەوەیەکی سەرزاری فەلسەفەی دێکارت بۆچوونەکانی ئەم فەیلەسوفەمان بە هەوڵدانێکی نایاب و گۆڕانکارییەکی مەزن لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا نیشان دەدات. لەبەر ئەمەشە هەوڵدانەکەی بەسەرەتای فەلسەفەی نوێ دادەنرێت و گوایە لەو ڕۆژەوە فەلسەفەی دێکارت پەیدا بووە ئێمەش خۆمان لەژێر کارتێکردنی کەلتووری زاڵبوی ئەریستۆ ڕزگار کردووە. ئایا دروستە دێکارت شۆڕشێکی مەزنی بەسەر ئەریستۆدا کردبێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بە بڕوای من نێگەتیڤە. لە هەندێك ڕووەوە دێکارت ئەریستۆی ڕەتکردووەو هەوڵی داهێنانی فەلسەفەیەکی نوێی داوەو لە ڕوویەکی دیکەوە

[54] - Rene Descartes. *Philosophical Writings*, Third Meditation, Nelson's University Paperbacks, 1970. P. 69

نەیتوانیوە بەتەواوی ئەریستۆ ڕەتبکات و خۆی لە ژێر کارتێکردنیا دەرباز بکات.[55]

کۆجیتۆکەی دێکارت لە چەند لایەندا کێشەی بوونی مرۆڤ ئاڵۆز دەکات و ئێمەش ئاڵۆز بوونەکە دەخەینە بەر ڕۆشنایی ڕەخنەو ڕەتی دەکەینەوە. ڕەتدانەوەکەشمان بەستراوە بە تێگەیشتنی ئێمە لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ و پێگەیەکی گرنگ و سەرەتاییە بۆ دەستکەوتە فەلسەفیەکەمان. ڕەخنەکانمان لەسەر بیرو باوەڕی دێکارت لەم خاڵانەدا کۆ دەبنەوە:

**یەکەم:** پێشخستنی من بیر ئەکەمەوە *Cogito*.

**دووەم:** دانانی ناوەڕۆکێکی- گیانەکی لە پێشتر بۆ بوونی مرۆڤ.

**سێیەم:** جیاکردنەوەی ناوەڕۆك لە (بوون)ەوە.

بۆ دێکارت بوونی مرۆڤ بەبێ بیرکردنەوە نابێت "دڵنیام لەوەی من هەم. تاکو کەی؟ تاکو ئەوکاتەی بیرکردنەوەم (Cogito) دەوەستێت." بیرکردنەوە(Cogito)بوە بە پێشمەرج بۆ بوون. ئەپستمۆلۆجی بووە بە

[55]- نامەوێ لێرەدا لەمە زیاتر درێژە بەم کێشەیە بدەم. پەیوەندی نێوان ئەریستۆو دێکارت پێویستی بە لێکۆڵینەوەی تایبەت هەیە. بەڵام حەز دەکەم بەخوێنەری ڕابگەیەنم، کە بۆچونەکانی دێکارت (بەتەواوی) دژی بیروباوەڕەکانی ئەریستۆ نین.

بناخەی ئۆنتۆلۆجی و ئەو خاڵە ڕەچاو نەکراوە، کە بەبێ بوون یا بەبێ ئۆنتۆلۆجی بیرکردنەوەو ئەپستمۆلۆجیش نابێت و بوون دەبێت بە بناخەیەکی زەروری لە پێشتر بۆ بیر کردنەوە. بێگومان من ئەوکاتە هەست بە بوونی خۆم دەکەم کە بیردەکەمەوە، بەڵام ناتوانم بیر بکەمەوە ئەگەر من نەبم. لە خاڵی دووەمدا، پاش دامەزراندنی کۆجیتۆکە دێکارت خۆی دەگەیەنێتە باوەڕێکی مێتافیزیکی. بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێت بڕیار لەسەر بوونی ناوەڕۆکێکی- گیانەکی بۆ مرۆڤ دەدات.[56] بوونی مرۆڤی کردووە بە دووبەشی جیاوازەوە هەر بەشە ناوەڕۆکی Substance تایبەت و خسڵەتی خۆی هەیە. بوونی ناوەڕۆکی- گیانەکی زەرورەیەکی لە پێشترە بۆ بوونی مرۆڤ. مرۆڤ بەبێ جەستە(ناوەڕۆکی ئەستوییی) دەتوانێ هەبێت بەڵام بەبێ ناوەڕۆکی- گیانەکی نابێت. ناوەڕۆکی-گیانەکی ئافەریدکراوو نەگۆڕو پێدراوە. تاکێك ناتوانێ ئەم ناوەڕۆکە بۆ خۆی بئافرێنێ، بەڵکو پێیدەبەخشرێت و خۆی داهێنەری ناوەڕۆکی خۆی نیە. ئەو هەرچیەك بێت چیەتیەکەی بەسەریدا سەپێنراوە، بۆی دانراوەو بوە بەخۆڕسکێکی نەگۆر لە بوونیدا. پەیوەندی نێوان ئەم دوو ناوەڕۆکە جیاوازەش نا-زەرورییەو هەریەکێك لەمان دەتوانن بەبێ یەکدی هەبن و بوونیان بەردەوام بێت. لێك دابڕانیان نابێتە هۆی لە ناوچوونی تاکەکەش، چونکە تاك، کە لە بنەڕەتدا ناوەڕۆکێکی-

---

Rene Descartes. Op. cit. , P. 74 -[56]

گیانەکیە نەك ئەستویی بۆ بوونی هانا بۆ جەستە نابات و بەبێ ئەو هەیەو پاش جیابوونەوەشی لەو ناوەڕۆکە ئەستوییی‌یە وەکو خۆی، بەبێ ئەوەی تۆزقالێك گۆڕانی تێدا ڕووبدات، دەمێنێتەوە. لە کارکردنەکانیاندا ناوەڕۆکی-گیانەکی پێویستی بەناوەڕۆکی ئەستویی نیە بەڵام دووەمیان بۆ جولاّن و بزوتنەوەکانی پێویستی بە یەکەم هەیەو بەبێ کارتێکردنەکانی ئەو کارەکان بە ئەنجام ناگەیەنێت. کەشتیەك بە بێ کەشتیەوان ناڕوات، کارکردنو گەشتی کەشتیەکە لەنێو دەریادا لە ئەنجامی کارتێکردنی کەشتیەوانەکەدایەو هەر یەکێکیش لەوان دەتوانن بەبێ یەکدی هەبن. بوونی هەریەکەیان گەرەنتی بوونی ئەویدیکە نادات و سەربەخۆن. لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی-گیانەکی یان کەشتیەوانەکە ئاگامەندە(بیردەکاتەوە) دەسەڵاتێکی کارتێکەرەو ناوەڕۆکی ئەستویش کارتێکراو. ئێمە لەدوو خاڵدا لەگەڵ دێکارتدا هاوڕاین. یەکەم، لەو خاڵەدا، کە بوونی مرۆڤی کردووە بەسەرەتای گەشتەکەی و دووەمیش ئەم بوونەی بە ئاگامەند داناوە. لەمە زیاتر ئەم زانایە نەیتوانیوە ئەریستۆ ڕەتبکات و بوونی ئاگامەندی بە ناوەڕۆکی-گیانەکییەوە بەستۆتەوەو ئەو ناوەڕۆکەش لەبەر ئەوەی خسڵەتێکی ئەستویی نیە ناکەوێتە بەر ڕۆشنایی ئەزموونی هەستەکییەوەو (کانت) گوتەنی؛ بەنەزانراوی دەمێنێتەوە. من هەر چەندە لە هاوڕێکەمەوە نزیك بم، لەبەر ئەوەی ئەو ناوەڕۆکێکی-گیانەکی‌یەو لەو دیوو یان لە ناو لەشیا خۆی شاردۆتەوەو لەشی بوە بە پەرژین لەنێوان من

و ئەودا ئەوا من ناتوانم ئەو بناسم یان بزانم ئەو چیە. ئەویش، وەکو من لە ئاستی ناسینی ناوەڕۆکی مندا بەو نەزانینەوە دەمێنێتەوە. دێکارت لەو باوەڕەدایە ناوەڕۆکی-گیانەکی لە هەموو شتێکی دیکە زیاترو باشتر بە حەدەس ناوەڕۆکی دەناسرێ. بۆ وێنە، ئەو بە حەدەس ناوەڕۆکی خۆی دەناسێت، بەڵام ڕێگەیەکی ئەپستمۆلۆجی بۆ دیاری نەکردووین تاکو ئێمە لە دەرەوەی بوونی یەکدیدا ناوەڕۆکی یەکدی بناسین. دەشێت هەندێك وا بۆ ئەم کێشەیە بچن، گوایە لە ڕێگەی دەربڕین و هەڵوێست و هەڵسوکەوتمانەوە خۆمان بەیەکدی دەناسێنین. بێگومان نکۆڵی لەم بۆچوونە ناکرێت، بەڵام هەڵوێست وەرگرتن و ئاکار لەم ڕووەوە ناوەڕۆکی-گیانەکی نین و دیاردەی ئەو ناوەڕۆکەن. لەبۆچوونی دوو لیستیدا هێڵێکی جیاکەرەوە بە ئاشکرا لە نێوان دیاردەو سەرچاوەی دیاردەکەدا کێشراوە. مەحاڵە هەر لەم بۆچوونە دوو لیستیەوەو وەکو (کانت)یش گەیشتۆتە ئەم ئاکامە نەرێییە، بتوانین سەرچاوەکە (نۆمینە) بەڕێگەی دیاردەکەیەوە یان فیۆمینەوە بناسین. ئەگەر ئێمە باوەڕمان بە ناوەڕۆکی-گیانەکی هەبێت، وەکو بوونێك لەو دیوو دیاردەو ناوەڕۆکی ئەستویی بەکۆکردنەوەی دەربڕین و هەڵوێست و ئاکارەکانیشی ناگەینە ئەو ئاکامەی لافی ئەوە لێبدەین ئێمە توانیومانە ناوەڕۆکی-گیانەکی بناسین یان کەوتۆتە بەر ڕۆشنایی زانینمانەوە. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونە فەلسەفیەکەی دێکارت و باوەڕ هێنان بەو ناوەڕۆکە

وەکو(شتێك) نەك بوخچەی دەربڕین و بیرەکان و ئاکارەکان. بیرکردنەوە لە ناوەڕۆکی-گیانەکی، وەکو کڵافەیەك هەموو ئەم دیاردانەی لە ناو خۆیدا پێچابێتەوەو بەلابردنیان کڵافەکەش هیچی نەمێنێتەوەو بوونی نەبێت بیروڕایەکە دایڤید هیوم(1711- 1776) پاش ڕەخنە گرتن لە دێکارت هێنایەکایەوە. بۆ هیوم ناوەڕۆکی-گیانەکی داهێنانێکی ئەندێشاوییەو بوونێکی ڕاستەقینەی نیە. هۆش، گیان یان دەروون بێجگە لە ڕێڕەوی هاتووچۆی بیرەکان و ئاکارەکانی مرۆڤ چیدیکە نیەو بەبێ ئەمانیش نیەو نابێت. هۆشی مرۆڤ، بۆ وێنە کڵافەی هەموو ئەو هزرانەیە، کە پەیدای کردووەو لەناویدا هەڵگیراون، بە لابردنی بیرەکان هۆشیش نامێنێت .[57] ڕەتدانەوەکەی هیوم بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی نیەو ئەپستمۆلۆجیانەیە. ئەم فەیلەسوفە، یەکێکە لە ڕێبەرانی فێرگەی هەستەکی، زانین بۆ ئەزموونی هەستەکی دەگەڕێنێتەوە. هەر شتێك نەکەوێتە بەر ڕۆشنایی ئەزموونی هەستەکیو لەو ئەزموونەدا نەناسرێت گومان لەبوونی دەکات. ناوەڕۆکی-گیانەکیش شتێك نیە خسڵەتی هەستەکی هەبێت و بەهەستکردن بدۆزرێتەوە، لەبەر ئەوە شتێك نیە بوونی بسەلمێندرێت. لەسەر ئەم پێگە ئەپستمۆلۆجیانەوە ئەم فەیلەسوفە باوەڕ بە هیچ شتێك ناهێنێت هەستەکی نەبێت و بیروباوەڕە مێتافیزیکیەکان و زانستیەکانیشی خستۆتە بەر نەشتەری ڕەخنە. بۆ ئەو چەمکە

---

57- David Hume. *A Treatise of Human Nature*, Second Edition, Oxford: At the Clarendons Press, 1985. P. 257

میتافیزیکیەکان وەکو(خوا، دەروون، هۆش و ناوەڕۆك)و چەمکە زانستیەکان، وەکو( هۆو ئاکام و هێزو...)بێ واتان و بوونیان ناسەلمێندرێت، چونکە هیچ شتێك نیە وەکو خوا، دەروون، هۆ، هێزو....، لە دەرەوەی بیرکردنەوەی مرۆڤدا بکەونە بەر ڕۆشنایی ئەزموونی هەستەکیەوە. بۆ ئەوەی دروستی چەمکی مێز بسەلمێنن پێویستە(مێز)وەکو شتێك لە دەرەوەی بیرکردنەوەماندا لە ناو قاوەخانەکەدا هەبێت. نەبوونی مێز چەمکی مێز دەکات بە دەستکردی ئەندێشەو نادروست. بەهەمان شێوە بۆ ئەوەی بزانین چەمکی هۆش دروستە، دەبێت بەو شێوەیەی مێزەکەمان لە ناو قاوەخانەکەدا دۆزیەوە(هۆش)یش لەدەرەوەی بیرکردنەوەی ئێمەدا، وەکو بابەتی بیرکردنەوە پەیدا بکرێت. بەڵام بۆ هیوم کەس ناتوانێت (هۆش)، وەکو مێزەکە بدۆزێتەوەو پەنجەی بۆ ڕاکێشێت. نەبوونی (هۆش)، وەکو بابەتی بیرکردنەوە لەبەر ڕۆشنایی ئەزموونی هەستەکیماندا واتای چەمکی هۆش لەبیرماندا پووچەڵ دەکاتو بە شتێکی لە ڕاستیەوە دووری دادەنێت.

بوونی مرۆڤ وەکو هەموو بوونێك و هەبوویەکی دیکە بونیادی ئۆنتۆلۆجی خۆی هەیەو خاوەنی خسڵەتی تایبەتمەندە. ئەو تایبەتمەندییەی جیاوازیەکی بنەڕەتی لە نێوان ئەم هەبووەکاندا پەیدا دەکات. تایبەتمەندیەتی بوونی مرۆڤیش لە چەند خاڵێکدا کۆدەبێتەوە:

یەکەم، بوونی مرۆڤ بە پێچەوانەی هەبووەکانەوە پێش ناوەڕۆکی دەکەوێت و ناوەڕۆکی لەبوونیدایە.[58] دووەم، ناوەڕۆك دەستەیەك خسڵەتی نەگۆڕو پێدراو نیەو ئەو پرۆژانەیە مرۆڤ خۆی هەڵیاندەبژێرێت و بەئەنجامیان دەگەیەنێت. سێیەم، لەبەر ئەوەی مرۆڤ بەبێ ناوەڕۆك پەیدا دەبێت و خۆی ناوەڕۆك بۆ خۆی دادەهێنێ ئەوا ناتەواوەو بوونێکی پڕی نیە. چوارەم، بوونی مرۆڤ ئاگامەندانەیە، یان مرۆڤ ئاگامەندییەو ئاگامەندانە هەوڵی تێگەیشتنی بوون دەدات و دەیەوێت خۆی تەواو بکات.

ئەم توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەمان بۆ بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ ڕادیکاڵانە بۆچوونە زاڵبوەکانی ئەریستۆو دێکارت ڕەتدەداتەوەو زەمینەیەکی نوێی فەلسەفیمان بۆ ئامادە دەکات. لە ڕوانگەی ئەم بونیادە ئۆنتۆلۆجیەشەوە پێویستی زمانێکی فەلسەفی نوێ بۆ توێژینەوەکەمان سەر هەڵدەدات و دەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی، کە کاتیگۆریەکانی ئەریستۆ نەتوانن لەم گەشتەماندا یارمەتیمان بدەن. بابزانین لە چ ڕوویەکەوە یان بۆچی توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەمان ڕادیکاڵانەیە؟ توێژینەوەکەمان لە دوو ڕووەوە ڕادیکاڵانەیە، یەکەم لە ڕەتدانەوەی بیروباوەڕە فەلسەفیەکانی لەپێشترو لە ڕوویەکی دیکەوە لە

58- Martin Heidegger. Op. cit., P. 67.

پێشخستنی بوون و دواخستنی ناوەڕۆکدا یان سارتەر گوتەنی لە هەڵگێڕانەوەی کۆجیتۆکەی دێکارتدا بۆ«من هەم کەوابوو من بیر دەکەمەوە». هەڵگێرانەوەی کۆجیتۆکەی دێکارت بۆ ئێمە هێندەی هەڵگێڕانەوەی فەلسەفەی هیگڵ لە لای مارکسەوە گرنگ و ڕادیکاڵە. دامەزراندنی ناوەڕۆکێکی لە پێشترو نەگۆڕ بۆ بوونی مرۆڤ جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکات، کە مرۆڤ، وەکو مێزەکە، پێش هاتنی بۆ ناو جیهان ناوەرۆکی لەپێشتری لەلایەن دەسەڵاتێکی دەرەکیەوە(سەدەمی یەکەمی ئەریستۆ)بۆ سازکراوەو بەو ناوەڕۆکە پڕو لەپێشترو پێدراوەوە پەیدا بوە. ئەو هەر ناوەڕۆکێکی پێدرا بێت دەبێت بە خسڵەتێکی نەگۆڕو چەسپاو بەبوونیەوەو دەسەڵاتی بەسەر گۆڕانکاریو هەڵبژاردن و ئافراندنی ناوەڕۆکی خۆیدا نابێت و بە ناچاری دەژی. ناچارەکی ڕەتدانەوەی دەسەڵاتی داهێنان و سەربەستی مرۆڤە و ڕێگەنادات مرۆڤ خۆی ناوەڕۆکی خۆی تەواو بکات و پڕۆژەکانی بوونی هەڵبژێرێت. داهێنان و تەواوکردنی ناوەڕۆك، کە لەگەڵ بۆچوونە ئایدیالیستیەکەی دێکارتدا ناکۆکە، ئاکامی لۆجیکمەندانەی بۆچوونە ئۆنتۆلۆجیەکەی ئێمەیە. بۆ دێکارت مادامەکی مرۆڤ خاوەنی ناوەڕۆکێکی لەپێشترو پێدراوە پێویست ناکات داهێنەر بێت و هەوڵی خۆ تەواوکردن بدات. ئەمەش لەئەنجامدا لە تووڵەرێیەکی داخراودا ڕاماندەگرێو نکۆڵی لە تایبەتمەندیەتی بوونی مرۆڤ دەکات و لەگەڵ هەبووەکاندا هاوتای

دەکات و جیاوازییەکی ئۆنتۆلۆجی لە نێوانیاندا دیاری ناکات. ناوەڕۆکی مرۆڤ داهێنانەو سەربەستیش پێشمەرجێکی زەرورییە بۆی. ئەگەر مرۆڤ سەربەست نەبێت و پڕۆژەکانی بوونی هەڵنەبژێرێت ناوەڕۆکی خۆی داناهێنێت. داهێنانی ناوەڕۆکیش لەو حاڵەتەدا ڕوودەدات کاتێك مرۆڤ بەبیَ ناوەڕۆکێکی لەپێشتر پەیدا بێت و بە ناتەواوی‌و بە نەبوونی ئەو ناوەڕۆکەوە بێتە نێو جیهانەوە. بە پێچەوانەی ئەمەشەوە بوونی مرۆڤ، وەکو بوونی مێزەکەی لیَ دێت و دەبێت بە شتێکی نەگۆڕو چەسپاوو لەوێدا دەتوانرێت پێناسە بکرێت.

بۆچوونەکەمان لەسەر (نەبوون) لێرەدا لەگەڵ بیروبۆچونەکەی (هیگڵ) دا ناکۆکە، کە لەپێشتر باسمانکرد. بۆ هیگڵ (بوون) بەگشتی یان بوونی هەمەکی، کە یەکەم کاتیگۆری لۆجیکەکەیەتی بووە بەسەرچاوەی (نەبوون).[59] بۆ ئێمە بوونی مرۆڤ سەرچاوەی نەبوونەو ئەم نەبوون لەگەڵ خۆیدا دەخاتە ناوبوونەوە. (نەبوون) بە تایبەتی لە واتای دووەمدا (بوونی مرۆڤ بەنەبوونی پەیدا بووە) هاندەرە بۆ گەیشتن بە تەواوکۆیی. گەیشتن بەتەواوکۆییش لە گۆڕانکاری و داهێنانی ناوەڕۆکدا ڕوودەدات. ناتەواوی بوونی ئەم بوونە دینامیکیەت و جوڵانێکی ئۆقرە نەگر دەخاتەگەڕو لەو دینامیکیەتەوە بوون پڕۆژەکانی

---

Hegel. Op. cit., Section 86. -[59]

خۆی بەئەنجام دەگەیەنێت و ناوەڕۆك بۆخۆی دەئافرێنێ و خۆی پڕ دەکاتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بوونی مرۆڤ لەبەر ئەوەی لە نەبوونەوە بەرەو نەبوونی دەڕوات و هەوڵی خۆ تەواوکردن دەدات(کات)یەو شتێکی نەبڕاوەو هەمیشەیی نیە. بە بەردەوامی ئێستای دەکات بە ڕابردوو و بەرەو داهاتووش لە پێناوی وەدەستهێنانی پڕۆژەکانی ڕەوتدەکات و بوونێکە لە ڕابردوودا ناژی و (ئێستا)ی کورت نەفەسەو چاو لە داهاتوو دەبڕێ. بوونێکە بۆ تەواوکردنی خۆی بەرەو داهاتوو دەڕواو لە هیچ وێستگەیەکی(ئێستا)دا خۆی ڕاناگرێت. بۆ ئەو ئێستا لە ڕابردوو، داهاتوو لە ئێستاو داهاتووی داهاتووش لە داهاتوو باشترو پێشکەوتووترەو ئاگامەندانە ڕووی تێدەکات.

بوونی مرۆڤ ئاگامەندەو ئەمەش هەبووەکانی لێبێبەشکراوە. ئاگامەندیش یان ئەم بوونە ئاگامەندە بە(نەبوون)یەوە ڕسکاوەو(نەبوون) بە بوونیەوە لکاوەو بە پێچەوانەشەوە هەبوویەك نەبووی نیە. بۆ نموونە مێزەکە، وەکو بابەتێکی هەبوو لەوە زیاتر بەچی دیکە نابێت، چونکە پڕو تەواوە. بوونی ئاگامەندی خاڵی و ناتەواوییەو پڕە لە کەموکورتی. شتێکە هەیەو لە داکەوتدا دەژیو شتێکیشە، کە نیەو نەبووە بەوەی خۆی دەیەوێت چونکە داهاتووی مەیدانێکی بەربڵاوو فراوانەو هێشتا دەستی بە

زۆر پڕۆژە نەگەیشتوە. هەیەو نیە یان بوون و نەبوونی ئاگامەندی بە سێ جۆر واتاکەی لێکدەدرێتەوە.

**یەکەم:** بوون ڕسکاوە یان لە نەبوونەوە پەیدابووە. سەدەمێکی هۆشەکی لە پێشتر (غایە)ی بە بوونی نەداوە.

**دووەم:** بوون لە گەشتە مێژوویەکەیدا کۆتاییەکی تراجیدی هەیە لە نەبوونەوە بەرەو نەبوون دەکەوێتەڕێ.

**سێیەم:** لەبەر ئەوەی ئەم بوونە ناوەڕۆکی لە پێشتری پێنەدراوە، ئەوا ناوەڕۆکی شتێکی (نەبوو) یان نەبوونە.

بوونی ئاگامەندی (مرۆڤ) لە نەبوونەوە بە نەبوونیەوە ڕوو لە نەبوون دەکات. ئەم دەستەواژەیە کورتەی ئەو سێ واتایەن لە سەرەوە ڕیزمانکردن. لە دوا قۆناخی گەشتەکەیدا، ئاگامەندی دیسانەوە خۆی بە نەبوون دەناسێو تراجیدیای مردن کۆتایی بە هەموو پڕۆژەکانی داهاتووی دەهێنێو لەنێو ڕابردوودا ڕایدەگرێ.

(کات) یان زوروانی ئەم بوونە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ڕەسەنیەتی ئەم بوونەوە هەیە. ڕەسەنیەتیش بە خۆ بوون و داهێنانی پڕۆژەکانە. بوونی ڕەسەن داهێنەری ناوەڕۆکی خۆیەتی و دەبێت بەوەی بۆخۆی دەیخوازێو دەسەڵاتە دەرەکیەکان نامۆو ناچاری ناکەن. سەپاندنی پڕۆژە بەسەر

بووندا هەمان ئاكامی نەرێیی دێكارتانەی هەیەو ناوەڕۆك لەدەرەوەی ویست و هەڵبژاردنی مرۆڤدا بڕیاری لەسەردەدرێ و دەئافرێنرێ. ئەگەر بوونی مرۆڤێك توانای داهێنانی ناوەڕۆكی خۆی نەبێت ناڕەسەنە. داهێنانی ناوەڕۆكیش، لە پرۆسە بەردەوامەكەیدا (كات)یان لە ناو زورواندایەو لە هیچ قۆناخێكی ژیاندا ناوەستێت و كۆتایی بە گەشتەكەی ناهێنێت. زوروان بۆ ئەم بوونە بەردەوامیەو ڕەوت بەرەو داهاتوو. لەم بەردەوامیەدا مرۆڤ هەر پرۆژەیەك بە ئەنجام بگەیەنێت ئەوا ئەو پرۆژەیە داهێنانی خۆیەتی و نابێت نكۆڵی لێ بكات. نكۆڵی كردن لە پرۆژەكانی بوون چ لە ڕابردوو یان لە داهاتوو مرۆڤ تووشی ناڕەسەنی دەكات. ڕابردووی ئەو چەند تاڵ بێت هێشتا ڕابردووی ئەوەو ئەو هێناویەتیەكایەوە. نكۆڵی كردن لە داهاتووش لەوێدا سەر هەڵدەدات، كە مرۆڤ بە ناچاری دەژی و خۆی بندەستی دەسەڵاتێكی دەرەكی دەكات و ئەو دەسەڵاتە بڕیار بۆ داهێنانی ناوەڕۆكی دەدات. بوونی ڕەسەن خاوەنی ڕابردوو و ئێستاو داهاتووی خۆیەتیو بوونێكی مێژووییە. بە پێچەوانە، بوونی ناڕەسەن خاوەنی ئەمانە نیەو بوونیشی نا-مێژووییە. مێژوو، كە خسڵەتێكی مرۆڤانەیەو تەنیا مرۆڤ خاوەنیەتی، داستانی ڕووداوەكانی ڕابردوو نیەو هەڵبژاردن و بڕیاردانە لەسەر پرۆژەكانی بوون. ناڕەسەنی بەم شێوەیەی ئێمە ڕوونمانكردۆتەوەو هایدیگەریش ئاماژەی بۆ

کردووە بە واتایەکی دیکە (نامۆ)یی‌یە.[60] نامۆییش بە خۆ نەبوون و داگیرکردنی بوونە لەلایەن دەسەڵاتێکی دەرەکیەوە، کە ڕێگە بە بوون نادات سەربەستانە ناوەڕۆکی خۆی بئافرێنێ. گرنگ نیە دەسەڵاتی داگیرکەرانە چ شێوەو ڕواڵەت و بوونێکی هەبێت، دەسەڵاتی مێتافیزیکی یان ڕامیاریو ئابووری یان کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی بێت، ئەو دەسەڵاتە دەیەوێت ناوەڕۆکی مرۆڤ داگیر بکات و بوونی بە نا-مرۆڤ بکات. نا-ڕەسەنی یان نامۆیی بە نامرۆڤکردنی مرۆڤەو هاوتاکردنیەتی لەگەڵ هەبووەکاندا. داگیرکەر جیاوازی لەنێوان کەلوپەلی بەردەستیو مرۆڤە بە نامرۆڤکراو و داگیرکراوەکەدا دانانێت و ڕێگە بەخۆی دەدات ئەو بوونە بکات بە موڵکی خۆی و بەو جۆرەی خۆی دەیخوازێ بۆ بەرژەوەندی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات. پەیوەندییەکانی نێوان داگیرکەرو داگیرکراو نایەکسانانە سەرهەڵدەدەن و وەکو پەیوەندی نێوان کۆیلەو خاوەن کۆیلە خۆی دەسەپێنێ. ئەم بەراوردکردنەمان ئەوە ناگەیەنێت کۆیلایەتی لە فۆڕمە سەرەتاییەکەیدا مابێتەوە. ئەمڕۆ بە گوێرەی یاسا کۆیلایەتی لە کۆمەڵگای سەدەمدا بە تاوان دادەنرێت و دەزگاکەشی هەڵوەشاوەتەوە. بەڵام داگیرکردن و بە نامرۆڤ کردنی مرۆڤ فۆڕمی دیکەی، وەکو نامۆیی چینایەتی، تاکەکەسیو بە نامرۆڤکردنی ئافرەت لە ناو کۆمەڵدا وەرگرتوەو لە ناو نەچوە.

---

[60] Martin Heidegger. Op.cit., P. -

ناڕەسەنی بارودۆخێکی نەرێ و ڕووداوەو بونیادێکی ئۆنتۆلۆجیو نەگۆڕی نیە. مرۆڤ ناڕەسەن نیە بەڵکو ناڕەسەن دەکرێت و ئەمەش لە سێ حاڵەتدا ڕوودەدات؛ یەکەم: مرۆڤ بوونی خۆی نەناسێو نەزانێ ئەو سەربەستە، بۆ نموونە منداڵی کۆیلەیەك لە خێزانێکی کۆیلەدا لەدایك دەبێت، دەشێت نەزانێت مرۆڤ دەبێت بە سەربەستی بژی. دووەم: مرۆڤ خۆی دەناسێت و دەزانێت ئەو سەربەستە، بەڵام لە ئاستی دەسەڵاتە داگیرکەرەکەدا سەرشۆڕەو خۆی بن دەست کردووە. سێیەم: هیگڵ ئەم حاڵەتە ناو دەنێت (ئایدیۆلۆجی کۆیلایەتی)[61] و سارتەریش (بڕوای خراپ)[62] و مرۆڤ خۆی دەگەیەنێتە ئەو باوەڕەی، کە بارودۆخە سەپێنراوەکە خراپ نیەو بەدیلێکی لەوە باشتریش پەیدا نابێت. لە هەر سێ حاڵەتەکەدا نکۆڵی لەو خاڵە بنەڕەتیە دەکرێت، کە بونیادێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ سەربەستی مرۆڤ مسۆگەر دەکات و ئەم بوونە بە سەربەست دادەنێت. لەبەر ئەمەش ئێمە لە سەرەتای توێژینەوەکەمان (کۆجیتۆ)کەی دێکارتمان ڕەتدایەوەو بوونمان پێش ناوەڕۆك داناو بە

---

[61] - Hegel. *The Phenomenology of Mind*, translated by J. B. Baillie, New York: Harper & Row Publishers, 1967. P. 251

بە بیروڕای هیگڵ کاتێك کۆیلە بە ئاگادێتەوەو دەزانێ مرۆڤ سەربەستە، بەڵام هێشتا ئامادەنیە خۆی دژی خاوەنەکەی بخاتە جەنگێکی خوێناوییەوە پەنادەباتە بەر جۆرێك ئایدیۆلۆجی (وەکو ئایین)کە بیگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کۆیلایەتی خراپ نیەو بەختەوەری مرۆڤ لەم جیهانەدا دەست ناکەوێو پاش مردن وەدەست دێت. لەبەر ئەمە پێویست ناکات کۆیلە هەوڵی گۆڕینی ژیانی بدات.

[62] - Jean-Paul Sartre Op. cit., P. 49

هەڵگێڕانەوەی کۆجیتۆ فەلسەفەیەکی مرۆڤ خوازی ڕادیکاڵمان داهێناو لە بوونی مرۆڤەوە، وەکو بوونێکی سەربەست و ناتەواو لەواتای بوون دەکۆڵینەوە.

تاکو ئێرە ئاشکرایە بۆچی نەمانتوانی شوێن بۆ چوونەکانی دێکارت بکەوین و کۆجیتۆکەی بەبێ گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی بەکار بهێنین. بیرکردنەوەی فەلسەفی ڕادیکاڵ نیە بانگەشەی سەربەستی نەکردبێت و بونیادێکی ئۆنتۆلۆجیشی بۆ سەربەستی مسۆگەر نەکردبێت. ئەو بونیادەی ئێمە بۆ سەربەستی ڕامانگرتبێت، نیهێلیزمی ئۆنتۆلۆجیەو بەبێ ئەم شێوازە بیرکردنەوە مێتافیزیکیەش یان لادان لە نیهێلیزم(هیچگەری) فەلسەفەکەمان ڕادیکالانە رۆڵی خۆی ناتوانێ ببینێ‌و تووشی هەڵەکەی دێکارت دەبێتەوە. بۆ نیهێلیزمی ئۆنتۆلۆجی بوون بەبێ غایە بەنەبوونیەوە بەرەو نەبوونی دەڕوات. ئەم هەڵوێستەش، کە بوون بە هیچ دادەنێت واتەکەشی لە هیچدا دەبینێ‌و واتاو غایەی لەپێشتر لەگەڵ خۆیدا بەرەو ڕۆخانەی (هیچ )و بێواتایی‌و بێ‌غایە ڕادەماڵێ‌و ژیان بە(بێهودە)لە قەڵەم دەدات.

پاش دامەزراندنی هەڵوێستی نیهێلیستیانەو ئەو گۆڕانکارییەی لەناو کۆجیتۆکەی دێکارتدا دروستمانکرد با لە خۆمان بپرسین چۆن لەم

ڕوانگەیەوە دەڕوانینە بوونی مرۆڤ؟ نیهێلیزم و ڕەتکردنەوەی دێکارت هەڵتەکاندنی بناخەی دۆگمای فەلسەفەکەیەتی. دێکارت ڕۆڵی سەرەکی مرۆڤی لە پەڕاوێزدا داناوەو، وەکو شتێکی هەبوو تەماشای کردووە. لەم هەڵوێستە ڕادیکالانەشمانەوەو لە ڕەتدانەوەی ئەم دۆگمایەدا دەگەینە ئاکامی هەڵوەشاندنەوەی (پێناس)ە بۆ بوونی مرۆڤ. پێناسەکردن وەك دەزانین پێویستی بە دەستەیەك خسڵەتی نەگۆڕ هەیە لە بوونی بابەتە پێناسەکراوەکەداو هەمووی بوونەکەش یان هەمووی هەبووەکە لە ناو چوارچێوەی تەسکی خۆیدا بەزۆر دەخزێنێتە ناوەوە. بەڵام ئەم بابەتە پێناسەکراوەمان، شتێکی چەسپاوو نەگۆڕ نیەو لە گۆڕاندایەو شتێکە، کە هەیەو لە هەمانکاتیشدا نیە. ناتەواوی و دینامیکیەتی ئەم بوونە ڕێگرو کۆسپن لە ئاستی پێناسەکردنیدا. ناسینی، وەکو دەردەکەوێت، کێشەیەکی ئاڵۆزی فەلسەفیەو دەگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی بوونی. ئەگەر مرۆڤ (هەبوو) بوایەو ناوەڕۆکێکی لە پێشتری بە بوونیەوە بنوسابایە تووشی ئەم کێشەوگێرەیە نەدەبووین و پێویستیشی نەدەکرد خۆمان بە پرسیارە گەورەو فەلسەفیەکانەوە ماندوو بکەین.

بونیادی ئۆنتۆلۆجیی بوونی مرۆڤ بەشێوەیەك پێکهاتووە، کە بوونەکەی کردووە بە پێناسەهەڵنەگر. بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین لە بەر ڕۆشنایی ڕێچکەی فینۆمینۆلۆجی هێرمینۆتیکی لە واتاکەی بکۆڵینەوەو

لایەنەکانی ڕوونبکەینەوە. هەوڵدانەکەشمان دۆزینەوەی ناوەڕۆك نیە، چونکە لەسەرەتاوە باسمانکرد ناوەڕۆکی مرۆڤ شتێکی پێدراو نیەو لە پرۆسەی جێبەجێکردنی یان بە ئەنجامگەیاندنی پرۆژەکانیدا پەیدا دەبێت. دەمانەوێت لەم ڕێچکەیەوە بوونی مرۆڤ بەو شێوەیە بناسین، کە خۆیمان بۆ دەردەخات و پێشمەرجەکان بۆ بوونی بدۆزینەوە. کێشەکەمان لێرەدا لە پرۆژە فەلسەفیەکەی (کانت)ەوە نزیکەو لەژێر کارتێکردنی ئەودا توێژینەوەکەمان دەخەینەگەڕ. کانت لە پەڕتووکەکەیدا *Critique of Pure Reason* بەدوای پێشمەرجەکان بۆ پەیدا بوونی (زانین) گەڕاوە. لە بەشی یەکەمی پەرتووکەکەدا (کات)و (شوێن)ی کردووە بە پێشمەرج بۆ ئەزموونی هەستەکی؛ ئەزموونی هەستەکی دەبێت لە ناو کات و شوێندا ڕوو بدات، بەڵام کات و شوێن ناکەونە نێو ئەزموونەکەوە. لە بەشی دووەمدا بۆ (تێگەیشتن) کاتیگۆرییەکانی کردووە بە پێشمەرج و لەو باوەڕەدایە هۆشی مرۆڤ بەبێ کاتیگۆرییەکان ناتوانێت (بیر)ەکان پێك بهێنێت. جیاوازی نێوان توێژینەوەکەی کانت و ئێمە لەوێدا یەك ناگرنەوە، کە کانت خۆی بە کێشەیەکی ئەپستمۆلۆجیەوە ماندوو کردووەو پێشمەرجەکانیشی بە(خۆیی)Subjective داناوەو بوونێکی ڕاستەقینەیان لەدەرەوەی بیرکردنەوە پێنەدراوە. بۆ ئێمە کێشەکە ئۆنتۆلۆجیەو دەمانەوێت پێشمەرجەکانیشی ئۆنتۆلۆجیانە یان بوونێکی ڕاستەقینەیان پێبدەین و بەتەنیا لە ناو جیهانی بیرکردنەوەدا نەبن. لەم خاڵەشدا زیاتر خۆمان لە

هیگڵ نزیك دەكەینەوەو بە پێچەوانەی ئەویشەوە پێشمەرجەكان بە كاتیگۆری دانانێن و ناویان دەنێین (پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی).[63] ئەوەی ئەم بوونە بە مرۆڤ دەكات و لە هەبوویەكی جیادەكاتەوە بوونیەتی نەك ناوەڕۆكی. ئەوەی دەبێت بە زەوییەكی هاوبەش لە نێوان تاكەكاندا دیسانەوە بوونە نەك ناوەڕۆك. تاكەكان ناوەڕۆكی جیاوازیان هەیە بەڵام هەموو بوونن و پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەكان بەسەریاندا ساخدەبنەوە. لەم گۆشەنیگاو پێگە نوێیەوە بوونی مرۆڤ، بەو شێوەیەی دەردەكەوێت، ناوەرۆكێكی گیانەكی نیەو بوونێكە بەبێ ناوەڕۆك پەیدا دەبێت. خاڵێكی گرنگی دیكەی جیاوازی كانت و ئێمە لەوەدایە، كانت هەوڵیداوە بوونی زانست یان زانینی زانستیانە بسەلمێنێت. كانت لێرەدا تووشی هەڵەیەكی گەورە بووەو وەڵامی زانستیانەی بۆ پرسیارە فەلسەفیەكانی (وەكو زانین چیە؟) ئامادەكردووە. ئەمەش كانتی گەیاندۆتە ئاكامێكی نەرێ سەبارەت بە ناسینی بابەتێكەوە، كە خۆی نەخاتەبەر ڕۆشنایی ئەو پێشمەرجانەی بۆ پەیدابوونی زانین دایناون و تووشی ئەو ناكۆكیەش هاتووە، كە بەبێ ئەوەی بیان ناسێت بە بەرز *Transcendent* دایناون.[64]

---

[63]- Martin Heidegger. Op.cit., P.70

[64]- زاراوەی بەرز یان بڵند Transcendent لە فەلسەفەی ئایدیالیستیدا (وەكو بۆچوونەكانی ئەفلاتۆن و ئەریستۆو دێكارت) بەو ڕاستیە دادەنرێت، كە دەكەوێتە ژوور ڕاستیی بوونی ماتریاڵەوەو گۆڕانكارییەكان و كات و شوێن كاری تێناكەن. هەروەها كانت زاراوەی Transcendental ترانسندێنتاڵ بۆ ئەو بابەتی زانین و زانینە بەكاردەهێنێت، كە هەمەكیەو ڕۆشنایی ئەزموونی هەستەكی پێناگات. بۆ ئێمەش مادامەكی پرۆژەكانی بوون لەدەرەوەی ئاگامەندین و ئاگامەندی هەوڵی خۆ گەیاندنیان دەدات ئەوا پرۆژەكان بەرزن. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئێمە وەكو ئەفلاتون بە فۆڕمی هەمەكی و لە ئەستو بەدەری دادەنێین. پرۆژەكان ئەو گونجاوانەن كە لەدەرەوەی ئاگامەندییدان و هێشتا بە ئەنجام نەگەیەنراون.

له سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەی ئێمەدا(بوون) تاکە ڕاستیەو هیچ شتێك یان هەبوویەك لەدەرەوەی ئەم ڕاستیەدا نیەو نابێت. بێگومان ئەم بۆچوونەمان گەلێك لە بۆچوونە مێتافیزیکیەکەی ئیبن عەرەبیو سوهرەوەردییەوە نزیکە. ئەوانیش لەسەر بناخەی کێشەی (لاموجود الا اللّە)هیچ بوونێك لە دەرەوەی بوونی خوادا بە ڕاست دانانێن. لەهەمان کاتیشدا سیستەمی ئەم دوو زانایەو ئەوەی ئێمە لە چۆنیەتی ناوەڕۆکیاندا لەیەکدی دەپچڕێن، بەڵام لە هەردوو سیستەمەکەدا(بوون) لە لایەکەوە بەرزەو لە لایەکی دیکەوە نزمە یان دوورەو نزیکە.

بوون بەرزە چونکە بابەتێك نیە، وەکو مێزەکە لە ڕێگەی ئەزموونی هەستەکیەوە بناسرێت و نزمیشە چونکە ئێمە بەشێکین لەو.[65] مێتافیزیك

[65]- بەراوردکردنەکەمان لەگەڵ سیستەمی مێتافیزیکی ئیبن عەرەبی و سوهرەوەردی بە تەنیا ئاماژەکردنێکەو دەتوانین لە بوارێکی دیکەدا بەدرێژی لەم کێشەیە بکۆڵینەوە. بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر لەبارەی بەراوردکردنەکەوە شارەزا بێت دەتوانێت بڕوانێتە بەرهەمەکانی ئەم دوو زانایە وەکو(فصوص الحکم)ی ئیبن عەرەبی و(حکمة الاشراق)ی سوهرەوەردی. هەروەها ویلیەم چیتك لەپەرتووکەکەیدا *Ibn Arabi's Metaphysics of Imagination* کێشەی پەیوەندی نێوان بوون و هەبووی بە درێژی باسکردوە. ئەمەش لە فەلسەفەی ئیبن عەرەبیدا بووە بە بناخەی ئۆنتۆلۆجی بۆ یەکگرتنی(خۆ)و بوون یان زاتی سۆفیو زاتی--- هەمەکی یەزدان لە ئەزموونی(حاڵ)دا. حەزدەکەم ئەو خاڵەش باس بکەم، کە لەگەڵ هاتنی شێخ ئەحمەدی سرهندی(1564-1624)، یەکێك لە پێشەوایانی تەریقەتی نەقشبەندی لە هیندو بە(ئیمامی ڕەبانی)ناسراوە، ڕاڕەی یەکانەگی بوون (وحدة الوجود)و فەلسەفەی ئیبن عەرەبی لای نەقشبەندییەکان ڕەتدراوەتەوە. شێخ سرهندی لەو باوەڕەدایە لە ئەزموونی (حاڵ)دا(خۆ)ی سۆفی ناتوانێت بگاتە پلەی یەزدان و لەگەڵیدا یەکبگرێت، ئەو تەنیا دەگاتە حاڵەتی بینینی خوا لە ناو هەموو شتێکدا و هەبووەکانیش بەمە لە بەیندناچن و لە ناو بوونی خودادا ناتوێنەوە. بۆ وێنە، کە خۆر هەڵدێت ئەستێرەکانی ئاسمان، کە بە شەو دەبریسکانەوە، نابینین، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت بە ڕۆژ ئەستێرە نیە.(بڕوانە: Shaykh Ahmed Sirhind *Maktubat*,Vol.1, Lahore: Nur Co., 1964. P.43) دوای شێخ سرهندی پێشەوایەکی دیکەی تەریقەتی نەقشبەندی لە مەدینە و شاگردی شێخ تاهیری کوردی (1733مردووە)بە

لە ڕوانگەی بۆچوونەکەمانەوە دەبێت بە زانستی بوون، یان ئەو ڕاستیەی دوورو نزیکەو بەرزو نزمەو لە دەرەوەی ئێمەدایەو ئێمەش لە ناو ئەوداین. ئێمە بەشێکین لە ئەو بەڵام ئەو بەشێك لە ئێمە نیە. ئێمە ئەوین بەڵام ئەو ئێمە نیە.

جارێکی دیکە دەگەڕێمەوە سەر باسی پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکان و لەو ڕێچکە فینۆمینۆلۆجیە هێرمینۆتیکیەوە لە بوونی مرۆڤ دەکۆڵمەوەو ئەو پێشمەرجانەی بۆ گونجاندنی ئەم بوونە پێویستن دەخەمە ڕوو. ئەگەر لە پێشمەرجێك زۆرتر بدۆزینەوە دەبێت لەو پێشمەرجەوە دەست پێبکەین کە لە هەمویان زیاتر لە پێشترو هەمەکی‌ترە. بۆ نموونە، ڕۆمانێك بەبێ زنجیرەیەك ڕووداو نانوسرێت. ڕووداوەکان خۆیان دەکەن بە پێشمەرج بۆ ڕۆمانەکە. بەڵام بۆ دەربڕینی ڕووداوەکان و نوسینەوەیان، وەکو دەق

ناوی شاوەلی(1763-1703) هەوڵیداوە ناکۆکیەکانی نێوان بۆچونەکانی ئەم دوو زانایە (ئیبن عەرەبی و سرهندی) چارەسەر بکات و هەردووکیان تێکهەلکێش دەکات. شاوەلی لەو باوەڕەدایە هەردوو بۆچوونەکە لە ناوەڕۆك و ئامانجیاندا یەکن و جیاوازی سێمەنتیکیان هەیە. تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستاندا زیاتر وابەستە بە بۆچوونەکانی سرهندی‌یەوە. مەولانا خالید(1827-1779) لە ژێر دەستی شێخ عوبەیدولڵای دەهلەوی(شا غوەڵام عەلی)(1824مردووە) سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی مەوجەدیدی کراوە بە خەلیفەو گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان. مەولانا خالید بە(خالید کوردی) لە هیند ناسراوەو تەریقەتەکەشی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و زۆر جێگەش لە تورکمەنستان و چیچنیاو داغستان بە تەریقەتی موجەددییە خالیدییە ناوزەدە. بۆچوونەکەی شێخ ئەحمەدی‌سرهندیش لە لایەن هەندێك مەلای مەککەو مەدینە تاوانبار کرا. یەکێك لەو مەلایانە(شێخ عەبدول ڕەسوڵی بەرزنجی) پەڕتووکێك دژی سرهندی دەنوسێ و لە ژێر کارتێکردنی ئەم پەرتووکەدا شەریفی مەکە نامە بۆ قازی دەلهی دەنێرێت و داوای لێدەکات کە سرهندی بە(زەندیق) دابنرێت.(بڕوانە:
Saiyd Athar Abbas Rizvi. *Shah Wali-Allah and His time*, Canberra: Marifat Publishing Hous, 1980. P. 324)

پێویستیمان بە زمان هەیە. زمان لەم نموونەیەدا پێشمەرجێکی لەپێشترە بۆ ڕۆمان. ئەم پێشمەرجانەی باسیان دەکەین بەم شێوەیە یەکێکیان لەوی دیکەیان هەمەکی‌تر خۆی دەردەخات و هەمووشیان پێکەوە بوونی مرۆڤ دەگونجێنن. پێشمەرجەکان، بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی (کانت)وە خۆیی‌و ئەپسمۆلۆجی نین و لەدەرەوەی بیرکردنەوەدان و داکەوتێکی ئۆنتۆلۆجیان هەیەو زادەی ئاگامەندی نین. ئەگەر ئەوان زادەی ئاگامەندی بن‌و لەناو بیرکردنەوەدا بن بە ئۆنتۆلۆجی ناوزەد ناکرێن‌و ئەوسا توێژینەوەکەشمان ئۆنتۆلۆجیانە نابێت. ئۆنتۆلۆجی بابەتگەرانەیەو ئاماژەی داکەوتێك لە دەرەوەی جیهانی بیرکردنەوەدا دەکات.

لە هەموویان لە پێشترو هەمەکی‌تر لە ناو پێشمەرجەکاندا بوونە لە ناو جیهاندا، کە پێشمەرجەکانی دوای ئەم بەبێ ئەم پێشمەرجە ناتوانن هەبن و بیریان لێناکرێتەوە. هەر پێشمەرجێکیش جێگای تایبەت و نرخی خۆی هەیەو گرنگیەکی فەلسەفی بۆ ئێمەش هێناوەتەکایەوە. پێشمەرجی بوون لە ناو جیهاندا ئەو گرنگییە فەلسەفیەمان بۆ دەسەپێنێت، کە توێژینەوەکەمان داکەوتی دەرەکی یان جیهان بە ڕاستی‌یەکی بابەتگەری دەخوێنێتەوەو بە زادەی بیرکردنەوەو ئەندێشەی دانانێت. تێگەیشتن لەم خاڵەشدا دەکەوێتە سەر واتای جیهان، وەکو پێشمەرج و چیەتی ئەم پێشمەرجە. بێگومان جیهان سیستەمی ئامێرو شارستانیەتە لە دەوروبەردا

زادەی بیرکردنەوەی و هزرە بەڵام جیهان وەکو جیهانێکی رووت و داکەوتێکی دەرەکی یان سروشت، کە مرۆڤی تێدا دەژی خۆیی نیە و بوونێکی لە پێشترە بۆ بوونی مرۆڤ. بۆ ئەوەی مرۆڤ هەبێت دەبێت جیهانیش هەبێت. بوونی ئەو بەبێ بوونی ئەم نیەو نابێت و ناتوانرێت بیر لە مرۆڤ بەبێ بوونی لە ناو جیهاندا بکرێتەوە. ئەمەش ئاماژەی سێ خاڵی گرینگمان بۆ دەکات:

**یەکەم:** بوونی مرۆڤ، وەکو ڕاستیەکی بەڵگەنەویست بووە بە بەڵگەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی جیهان. مادامەکی من هەم و پێویستە لە نێو جیهاندا بم، ئەوا جیهانیش هەیە.

**دووەم:** بوونی مرۆڤ جیهانی‌یەو لە جیهان جیانابێتەوەو بەبێ جیهانیش نابێت. لەبەر ئەمە بوونی بەشتێکی دیکەوە لەدەرەوەی جیهان یان لە جیهان بەدەردا نابەسترێتەوە. ئەو هەر چیەك بێت، چۆن بیر لە بوونی خۆی بکاتەوە ناتوانێت ئەم ڕاستیە ڕەچاو نەکات.

**سێیەم:** بوونی مرۆڤ بوونێکی جیهانگەرییە، جیهان بۆ ئەو بە تێکڕا نیشتمانی ئەوەو گۆڕانکاری شوێن و کات ئەو ڕاستیە ناگۆڕن، کە ئەو بوونی بە جیهانەوە گرێدراوە.[66] بێگومان جیهان شێوازی زۆری هەیەو چیەتیەکەی بە گوێرەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ بوونی مرۆڤدا دەگۆڕێن بەڵام واتا فەلسەفیەکەی، وەکو خۆی دەمێنێتەوە. جیهان بۆ جوتیارێك

---

[66] - Martin Heidegger. *Being and Time*, P.78

کێڵگەو دانەوێڵەو مەڕو ماڵات و باخ‌و ڕەزو کەلوپەلە بەردەستەکیەکانیەتی لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەکاریان دەهێنێت. بۆ کرێکارێك لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ ئەمانەدا نیە، جیهانی ئەو جیاوازترەو زیاتر واتاکەی بە کارکردنەکەیەوە لە کارخانەو ناو ماکینەو بەرهەم هێناندا خۆی دەردەخات. ئەگەر پرسیاری واتای جیهان لە جوتیارێك و کرێکارێك بکەین وەڵامەکەی بە دوو جۆری جیاواز دەستدەکەوێت و بە شێوەی مامەڵەکردنییان لەگەڵ جیهاندا دەگۆڕێت و واتایەکی هەمەکی‌و فەلسەفیمان بۆ ڕوون ناکاتەوە. واتای هەمەکی جیهان بەستراوە بەبوونی جیهانەوە، وەکو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی. جوتیارو کرێکارەکە لە هەر شوێن و کاتێکدا بن و لە ناو هەر بارودۆخێکدا لە گەڵ جیهان مامەڵە بکەن ئەوا لەسەروو ئەمانەوە جیهان پێشمەرجێکە بۆ بوونیان و شێوازی مامەڵە کردنەکەشیان. بۆ ئێمە گرنگ نیە تاکەکان چ شێوەیەکی پەیوەندی لە ژیانی ڕۆژانەیاندا لەگەڵ جیهاندا دەبەستن و چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، ئەوان هەرگیز ناتوانن بەبێ جیهان هەبن. بەم شێوەیەو لەم زەمینەوە ئەو بیروباوەڕە فەلسەفیە ڕەتدەدەینەوە، کە جیهانی دەرەکی بە بیرو زادەی ئاگامەندی دادەنێت و ڕاستیە دەرەکیەکان و داکەوت بۆ ناو جیهانی خۆ دەگەڕێنێتەوە. چونکە ئەگەر جیهان (بیرۆکە)یان(خۆیی)بێت ئەوا نابێت بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونێك، کە ئەو بوونە خۆی پەیدای کردبێت و لە بیرکردنەوەدا ئافەریدی

کردبێت. بیرکردنەوە بناخەی بوون نیەو بوون بناخەی بیرکردنەوەیە، ئەمەش ئەو خاڵە سەرەکیە ئۆنتۆلۆجیە بوو لە سەرەتاوە بۆچوونەکەی ئێمەو دێکارتی لەسەر دوو هێڵی هاوتەریبی بەیەك نەگەیشتوو دانا.

ئەگەر جیهان پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بێت پێویستە مامەڵەکردنی مرۆڤ و پەیوەندییەکانی لەگەڵیدا شێوازێکی تایبەتی وەرگرێت. بە حوکمی ئەوەی مرۆڤ جیهانی و جیهانیگەرییەو لەناو جیهاندایەو بەبێ جیهان نیەو نابێت، ئەوا جیهان، وەکو داکەوتێکی دوورو هەڕەشەکەر خۆی دەرناخات و مرۆڤیش لەناو جیهاندا بە بێگانەیی ناژی. خۆ دوورخستنەوە لە جیهان و بە پەراوێزکردنی جیهان ئاکامێکی نەرێ دەرەخسێنێ و دوو شێوە هەڵوێستی جیاواز بەسەرماندا دەسەپێنێت؛ مرۆڤ هەوڵدەدات داکەوتی دەرەکی داگیر بکات و بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی بەکاری بهێنێت، یان نکوڵی لە گرنگی جیهان دەکات و هەمیشە خۆی لە بەرامبەریدا بە بێگانە دادەنێت و دەیەوێت خۆی لێ دابڕێ. لە هەردوو هەڵوێستەکەدا واتا ئۆنتۆلۆجیەکەی جیهان ڕەت دراوەتەوەو جیهان بە هێزێکی دەرەکی و مەترسی لێکەر دانراوە. هەڵوێستی یەکەم لە قۆناخی تازەگەریدا بۆتە هۆکاری داگیرکردنی جیهان و بەکارهێنانی جیهان. لەئاکامدا کارەساتی تێکشکانی ژینگەی مرۆڤ هاتۆتە پێشەوەو مرۆڤ بەدەستی خۆی ژیانی خۆیو شارستانیەتی خستۆتە مەترسیەوە. لە

هەڵوێستی دووەمدا مرۆڤ بەهۆی هەستکردنی بێگانەبوون و نامۆیی لەگەڵ جیهاندا دوورەپەرێز لە ئاستی ڕووداوەکانی مێژوودا ڕادەوەستێ و چاو دەبڕێتە ژیانێکی باشتر لە ژوور جیهانەوە.

دیسانەوە لە ڕوونکردنەوەی پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و جیهاندا دەگەڕێمەوە بۆ فەلسەفەکەی دێکارت و لە ڕەتدانەوەی بۆچوونەکانی ئەوەوە ئاماژەی دامەزراندنی پەیوەندییەکی گرنگتر دەکەم. وەکو دەزانین دێکارت پەیوەندی نێوان خۆو جیهانی دەرەوەی خۆی ئەپسمۆلۆجیانە لێکداوەتەوە. بێجگە لە ڕێگەی ناسین خۆ پەیوەندییەکی دیکەی لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا نیەو لە دواییدا ئەم پەیوەندییەش لە ڕێچکەی فینۆمینۆلۆجی هۆسرڵدا بووە بە کێشەیەکی سەرەکیو لەو ڕوانگەیەشەوە ئاگامەندی یان بیرکردنەوە بووە بە بیرکردنەوە لەشتێکەوە. بەڵام ئێمە ئەو پرسیارە لە دێکارت دەکەین، ئایا زانین تاکە پەیوەندییەکە لەنێوان خۆو جیهانی دەرەوەی خۆدا؟ بە بیروڕای ئێمە نا. خۆ پێش ئەوەی پەیوەندییەکی ئەپستمۆلۆجیانە لەگەڵ جیهانی دەردەوەدا ببەستێت و بە دوای واتاو ناوەڕۆکیدا بگەڕێت پراکتیکیانە هەڵوێستی خۆی دەردەخات. منداڵ نازانێت بووکە شوشە چیەو چۆن دروستکراوە کەچی هەموو رۆژێك یاری پێدەکات. جوتیارێك لە واتای گاسن تێناگات و بەبێ ئەوەی لەخۆی بپرسێت ئەو ئامێرە چیە، جووتی پێدەکات. ئێمەش بەبێ

ئەوەی لە ناوەڕۆکی کلیل بکۆڵینەوە ڕۆژانە چەندین جار کلیل بۆ کردنەوەی دەرگای ژوورەکەمان بەکاردەهێنین. پەیوەندی ئەپستمۆلۆجیانە لەو حاڵەتە دادەمەزرێت، پرسیار لە منداڵەکە یان لەجوتیارەکە یان لەخۆمان لە بارەی بووکە شوشەو گاسن و کلیلەکەوە بکەین. لەوێدا ڕادەوەستین و هەوڵی ناسینی ناوەڕۆکی بابەتەکە دەدەین. هەموو ئەو بابەتانەی لێرەدا ئاماژەمان بۆ کردن و زۆریتریش لە ژیانی ڕۆژانەماندا بەکاریان دەهێنین جیهانێکی تایبەتین بۆ مرۆڤ و پەیوەندییەکی پراکتیکیان لەگەڵ مرۆڤدا هەیە. ئەم پەیوەندییەش پێش پەیوەندی ئەپستمۆلۆجی دەکەوێت. لەم پەیوەندییەدا خۆدەرختستنی بابەتەکەش، وەکو ئامێرێکی بەکارهێنراو بۆ مەبەستێکی دیاریکراو یان لە پێناو شتێکدا شێوازێکی تایبەتی هەیەو ئەوەندە خۆی بە زەقی دەرناخات و خۆی بەزۆر ناسەپێنێت. لە کاتێکدا بابەتەکە لە پێویستیدا ، بۆ بەکارهێنانی، لەپێناوی شتێکدا خۆی وونددەکات، بوونی زیاتر خۆی دەسەپێنێت. جوتیارەکە هەموو رۆژێك گاسنەکەی بۆ جووتکردن بەکار دەهێنێت، بەڵام ئەو ڕۆژەی پێویستی پێیەتیو گاسنەکە نادۆزێتەوە یان ئەشکێت و ناتوانێ بەکاری بهێنێت، بوونی گاسنەکە لە ناو چوارچێوەی پێویستی ئەوکاتدا بۆ جووتیارەکە دەبێت بە دیاردەیەکی زاڵبوو. جوتیارەکە ناچار دەکات بیری لێبکاتەوەو بە شوێنیدا بگەڕێت. بوونی لە دۆزینەوەدا یان لە پەیدا کردنیدا جارێکی دیکە لەپڕ دەبێت بە دیاردەیەك ، کە ناتوانێت

ڕەچاو نەکرێت. بە هەمان شێوەش من هەموو ڕۆژێك چەند جارێك کلیلی ژوورەکەم بەکاردەهێنم، بەڵام ئەگەر کلیلەکەم لێ وون بێت، بوونی کلیلەکە خۆی بەسەر مندا دەسەپێنێ و ناچارم دەکات بەدوایدا بگەڕێم و بیر لە بوونی بکەمەوە. لەوەوپێش لە بەکارهێنانی ڕۆژانەی کلیلەکەدا ئەم هەڵوێستەم لەگەڵیدا نەبوو. ئەم نموونانە بەڵگەن بۆ دانانی پراکتیك بە پەیوەندییەکی پێشتر لە زانین. منداڵەکە یان جوتیارەکەو ئێمەش پێویستیمان بەوە نەبوو بزانین بووکە شوشە، گاسن یان کلیل چین و بەبێ ئەو زانینانە بەکارمان هێناون. ئەمەش ڕۆڵی زانین کەم ناکاتەوەو تەنیا بە پەیوەندییەك نەك تاکە پەیوەندیی لە نێوان خۆو جیهانی دەردەوەی خۆدا دایدەنێین. بێجگە لەم دوو پەیوەندییەش خۆ بە سۆزو عاتیفەشەوە هەڵسوکەوت لە گەڵ جیهاندا دەکات و ڕووداوەکان کاریتێدەکەن. پەیوەندی سۆزەکیش، کە بە هیچ جۆرێك دێکارت باسی نەکردووە پێش پەیوەندی ئەپستمۆلۆجی دەکەوێت. سۆز مەزاجەو لای مرۆڤ سەرهەڵدەداو دەیگۆڕێ، چونکە لە پەیوەندییەکەدا ڕووداوەکان بە چاك و خراپ کارتێکردنی خۆیان لەسەر مرۆڤ تۆماردەکەن و مەزاجی دەگۆڕن. هەندێك لە ڕووداوەکان مەزاجی خۆش و هەندێکیش ناخۆش دەهێننەکایەوە، لە هەردوو حاڵەتەکاندا مرۆڤ مەزاجی‌یە.[67] بە پێچەوانە ئەزموونی هەستەکیشەوە مەزاج پێویستی بە ڕاستەوخۆیی بابەتەکەی

---

[67] Ibid., pp.172-179 -

نیه. ڕووداوێك له شوێنێكی دوور ڕوودەدات و ئێمه لەناویدا ناژین بەڵام كارتێكردنی بەسەر مەزاجمانەوه هەیەو ئێمه دەجولێنێت و مەزاجێكی تایبەتیمان تێدا دەخولقێنێ. هەواڵی مردنی خۆشەویستێكمان، بەبێ ئەوەی بزانین بۆچی ئەوكەسه مرد یان مردن چیه، مەزاجمان دەگۆڕێو خەمبارمان دەكات و بیستنی هەواڵێكی خۆشیش دڵمان شاد دەكات. پەیوەندی سۆزەكی نێوان مرۆڤ و جیهان دیسانەوه له گرنگی پەیوەندی ئەپستمۆلۆجیانه كەم ناكاتەوه. بەڵام ئەو خاڵەمان بۆ ڕووندەكاتەوه، كه پەیوەندیی ئەپستمۆلۆجی تاكه پەیوەندی نیەو مرۆڤ پەیوەندی جۆراوجۆری لەگەڵ جیهاندا هەیەو (زانین)یش یەكێكه لەوان و شێوازێكی پەیوەندییەو له ژیانی ڕۆژانەماندا پاش پەیوەندییه پڕاكتیكیو سۆزەكیەكه دەكەوێت. من ناڵێم ئێمه له ئەنجامدانی پڕۆژەیەكدا پڕاكتیك پێش بیردۆزه دەكەوێ. نكۆڵی لەوەناكرێت لەپێش ئەنجامدانی پڕۆژەیەك نەخشەی ئەو پڕۆژەیه له بیركردنەوەدا پەیدا دەبێت و دوای ئەوه پڕۆژەكه دەهێنرێتەكایەوه. ئەمه هەڵوێستێكی ئەپستمۆلۆجیانەیەو له ئەنجامدا ئەو زانینه بۆ دامەزراندنی پڕۆژەكه خراوەتەگەڕ. هەر كەسێك بیەوێت پڕۆژەیەك به ئەنجام بگەیەنێت بەم پڕۆسەیەدا دەڕوات و زانین پێش پڕاكتیك دەخات، چونكه به ئەنجامدانی پڕۆژه وەستانه له ئاستی شیكردنەوەو ڕوونكردنەوەی واتای پڕۆژەكه. مرۆڤ ناتوانێت بەبێ ئەوەی بیر له پڕۆژەیەك بكاتەوه یان هیچ بیرو نەخشەیەكی ئەو پڕۆژەیەی له

نێو بیردابێت بەئەنجامی بگەیەنێت. ئەمەش هەڵوێستێکی ئایدیالیستیانە نیەو کێشەی پێشخستنی بیرکردنەوەو دواخستنی ئەستوو(ماتەر) لە مێتافیزیکدا نیەو بەلای کێشەی مریشك و هەیلکەش پەلکێشمان ناکات. تەنانەت مارکس، وەکو فەیلەسوفێکی ماتریالیست لەگەڵ ئەمەدا هاوڕایەو بە بیروباوەڕی ئەو، ئەوەی بەرهەمی مرۆڤێك بە بەها دادەنێت و لە جوانترین داوی جاڵجاڵۆکەو هێلانەی باڵندەیەکی جیا دەکاتەوە بیرکردنەوەی بەرهەم هێنەرەکەیە پێش ئەوەی بەرهەمەکە دابهێنێت.[68] مارکس، بە پێچەوانەی ئایدیالیستەکانەوە، لە سیستەمە فەلسەفیەکەیداو لەسەر زەمینەیەکی ئۆنتۆلۆجی بوونی ئەستوو پێش بوونی ئاگامەندی یان بیرکردنەوە دەخات، بەڵام کاتێك مامەڵە لەگەڵ بیردۆزە و پڕاکتیك دەکات، بێجگە لەوەی باوەڕی بە پێکەوە بەستنی زەروری لە نێوانیاندا هەیە، بیردۆزە دەخاتە پێشەوەو ئەمەش دەکات بە خسڵەتێکی بنەڕەتی بۆ کارکردن و بەرهەم هێنان.[69] لەبەر ئەوەی بەرهەم هێنان پڕۆژەیەو پێویستی بە بیرکردنەوەو نەخشەکێشانی لە پێشتر هەیە مارکس بە تەنیا جەختی لەسەر چۆنیەتی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم پڕۆژەیەو پەیوەندی نێوان بیردۆزو پڕاکتیك کردووە. لەو پەیوەندییە پڕاکتیکیە، کە ئێمە باسمانکردوو لە پێش زانینەوە دامانناَ، نە دواوەو لە هیچ نوسراوێکیدا ئاماژەی بۆ نەکردووە. لەم گۆشە نیگایەوە مارکس

[68]- Karl, Marx. *Capital*, Vol.1, Moscow: Progress Publishers,1986, P. 174

[69]- هەمان سەرچاوە.

لەگەڵ دێکارت لەسەر کێشەی پەیوەندی زانین لەگەڵ جیهانی دەرەوەی خۆدا، وەکو تاکە پەیوەندییەك هاوڕایە. ئەویش باسی یەك شێوازی پەیوەندییمان بۆ دەکات، کە پەیوەندی ئەپستمۆلۆجیە. بەڵام مارکس زانینی بە پڕاکتیکەوە گرێداوەو داوا دەکات زانین لە ڕێگای پڕاکتیکەوە ببێت بە دەسەڵاتی گۆڕین و داهێنانی داکەوت و[70] ڕۆڵی مێژوویی مرۆڤ لە دامەزراندنی ژیارو بەرەو پێشەوە چوونی ژیانی ئابووریو ڕامیاریو کۆمەڵایەتیدا فەرامۆش ناکات.[71] ئەمەش کارتێکردنی فەلسەفەی هیگڵە بەسەر بیرو باوەڕەکانی مارکسەوە. بەگوێرەی لۆجیکی دیالێکتیك لایەنە ناکۆکەکان پەیوەندییەکی زەروریان پێکەوە هەیەو گرێدراون و ناتوانین لە لایەنێکیان بەبێ لایەنەکەی دیکە بگەین. لەبەر ڕۆشنایی ئەم پەیوەندییە دیالێکتیکیەش بیردۆزو پڕاکتیك لە یەکدی جیا نابنەوەو زانین دەبێت داکەوت بگۆڕێو گۆڕانی داکەوتیش بە بێ زانین ڕوو نادات. زانین لە پێناو زانیندا کێشەیەکی بێبەرو نەزۆکەو پێویستە لەناوبچێو زانین لە پێناوی گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو بەکار بهێنرێت. لەم حاڵەتەدا بیردۆزە خۆی دەکات بە ئامێرێکی

---

[70] - Karl, Marx. "Thesis on Feuerbach", *The Portable Karl Marx*, New York: Penguin Books, 1993. P. 156

[71] - لە (فەلسەفەی سارتەرو خوێندنەوەیەکی نوێ) ئاماژەی ئەو خاڵەم کردووە، کە مارکس بە پێچەوانەی ئینگڵزو چەند زانایەکی مارکسی دیکەشەوە گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو تەسلیمی باروودۆخی دەرەکی ناکات و ویستی مرۆڤیش ناچار ناکات. بەبیروڕای من بۆچوونەکانی مارکس و ئینگڵز لەم ڕووەوە جیاوازو ناکۆکن. مارکس هیگڵیانەو ئینگڵز زانستیانە دەڕوانێتە کێشەکە.

کاریگەر بۆ داهێنانی گۆڕانکاری‌و لەم ڕووەشەوە فەلسەفەی (مارکس) فۆڕمێکی ڕادیکالانە بەبەر خۆیدا دەکات. مرۆڤ ئاگامەندانەو بەکردەوە زانین و پڕاکتیك پێکەوە دەبەستێت و داکەوتی دەرەکی بۆ ئەو جیهانە دەگۆڕێت، کە خۆی دەیخوازێ. لە(کارکردن)دا زانین و پڕاکتیك دەبن بە یەك. بەم جۆرە (کارکردن)، بە دیدی (مارکس)یش، سێ لایەنی لەناو خۆیدا کۆکردۆتەوە ویست و زانینی مرۆڤ و سروشت و بەرهەم. کارکردن دیاردەیەکی دیکەی جیهان دەخاتە بەر ڕۆشنایی زانین و سروشت دەکات بە جیهانێکی مرۆڤانە. جیهانێك، کە هەلقولاوی بیرکردنەوەو ویستی مرۆڤەو پێداویستیەکانی بۆ پڕدەکاتەوە. ئەم دیاردەیە چیاو دارستان و ڕووبار نیەو دیاردەیەکە پێداویستیەکان واتای پێدەبەخشێت و ناوەڕۆکی دەداتێ. لەم جیهانە داهێنراوەدا چیا دیاردەیەکی بەرزو بەردەلان نیە، کە ئێواران خۆر لە پشتیەوە ئاوا دەبێت و زستانانیش بەفر دایدەپۆشێت. دارستان سەوزەلانی و شوێنی پڕ دار نیەو ڕووباریش هاژەو خوڕەی ئاو نیە. لەم جیهانەدا مرۆڤ چیا، وەکو کانی بەردو دارستان، وەکو سامانێکی تەختەو ڕووباریش، وەکو سەرچاوەیەك بۆ کشت و کاڵی ناوچەکە دەبینێت. بەم شێوەیە جیهان لە توێژینەوەکەماندا لە چەند فۆڕمێکی جیاوازدا خۆی دەردەخات؛ یەکەم، پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ. دووەم، شوێنێکە مرۆڤی تێدا پەیدا دەبێت و ناوەڕۆکی خۆی تێدا دادەهێنێت و لە وێدا لە بەینیش دەچێت. شوێنی پەیدا بوون و

لەبەین چوونەو کێڵگەی بەرفراوانی دامەزراندنی پڕۆژەکانی بوونە، کە ناوەڕۆك پێك دەهێنن. سێیەم، جیهان سروشتەو مرۆڤ داینەهێناوە، بەڵام ڕاستەوخۆ کەڵکی لێوەر دەگرێت و بۆ ئەو جیهانەی دەگۆڕێت، پێویستیەتی. چوارەمیش، جیهان داهێنراوی مرۆڤەو ئەو کەلوپەلانەن لە ژیانی ڕۆژانەیدا بە کاریان دەهێنێت.

بوونی مرۆڤ لە ناو جیهاندا بوونە لە شوێنێکداو ئەمیش وەکو بوونی جیهان دەبێت بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیو لەم ڕوانگەیەشەوە دیسانەوە هەڵوێستی ڕەت دانەوەمان بەرامبەر بۆچوونەکەی کانت لە ئاستی لێکدانەوەی (شوێن)، وەکو فۆڕمێکی خۆیی دیاریدەکەین. لەوەو پێش باسکرا، کە کانت کات و شوێنی بە دوو پێشمەڕجی خۆیی(لەناو بیرکردنەوەدا) بۆ ئەزموونە هەستیەکان دامەزراند. ئەمەش بیروڕایەکی جیاوازە لەوەی ئێمە هەوڵی ڕوونکردنەوەی دەدەین. تاکو ئەو خاڵەی(شوێن)بە پێشمەرج دادەنێت لەگەڵ ئەم فەیلەسوفەدا هاوبۆچوونین و لەوێشدا لە ئەو جیادەبێتەوە، کە (شوێن)بە فۆڕمێکی خۆیی دادەنێت و باوەڕ بە بوونی لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا ناهێنێت. بۆ ئێمە لە سەر ئەو بناخەیەی دەمانەوێت توێژینەوەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ لەسەر دامەزرێنین، هەموو پێشمەرجەکان ئۆنتۆلۆجیانەن و بوونیان بە بوونی بیرکردنەوە، گرێنەدراوەو لە دەرەوەی جیهانی خۆدا هەن. ئەگەر

جیهان یان شوێن ئۆنتۆلۆجیانە نەبن و بوونێکی بابەتگەرانەیان نەبێت ئەوا نابن بە پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجیانەو لەو حاڵەتەدا دەبێت بیرکردنەوە بیان دۆزێتەوە. شتێکیش هەڵقولاوی بیرکردنەوە بێت بوونێکی لە پێشتری نابێت.

بوون لە شوێنێکدا، بۆ مرۆڤ، واتای تایبەتی خۆی هەیەو لەواتای شوێنی فیزیکیەوە جیایە. مەبەستی ئێمە لێرەدا لێکۆڵینەوە لەسەر واتای شوێن نیەو هەوڵدەدەین لە بوون لە ناوشوێندا، وەکو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بگەین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بوونی مرۆڤ بەبێ لەناو شوێندا نیەو نابێت. لەبەر ئەمە شوێن و بوون لە ناو شوێن دوو کێشەی جیاوازن و دووەمیان بەستراوە بە بوونی مرۆڤەوە. بوون لە ناو شوێندا لە سێ بڕگە پێکهاتووەو ئاماژەی پەیوەندی بوون لەگەڵ شوێندا دەکات. بوون و لەناو شوێندا هەردووکیان بەبێ یەکدی لەواتا بەدەرن. لە ناو شوێندا بەبێ بوون واتای نیەو بە پێچەوانەشەوە دروستە. لەناو شوێن، وەکو لەناو جیهانیش داکەوتێکی دەرەکیە، چونکە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیەو، وەکوفۆڕمی(شوێن)لە فەلسەفەی (کانت)دا خۆیی نیە. بەلاّم ئێمەش چۆن کانت(شوێن)ی بە پێشمەرج بۆ زانین دادەنێ، (لەناو شوێن)دەکەین بە پێشمەرج بۆ بوونی مرۆڤ و ئەم دوو بۆچوونەش دوو زەمینەی فەلسەفی جیاوازیان هەیە. لە پێوەندی نێوان بوون و لە

ناوشوێندا، بوون واتا بە شوێن دەبەخشێ. پارچەیەك زەوی خانویەكی لەسەر دەكرێت و خانوەكەش دەبێت بەماڵی كەسێك. لێرەدا بوونی مرۆڤ لەم پەیوەندییەیدا لەگەڵ شوێن واتای جیاواز بە زەوی‌و خانوو ماڵ دەدات، كە هەرسێكیان شوێنن بەڵام هەر یەكەیان واتای تایبەتی بۆ ئەو كەسە هەیە، كە لەگەڵیدا پەیوەندی دەبەستێت. بۆ خاوەن زەوی‌یەكە ئەو شوێنە پارچە زەوییەكەو بە كەسێكی فرۆشتوەو ئەوكەسەش كردوویەتی بە خانوو بەكەسێكی دیكەی بەكرێداوەو ئێستا ئەو شوێنە بۆ ئەم كەسە بوە بەماڵ. دەبینین ئەو شوێنە بۆ ئەم سێ كەسە واتای جیاوازی هەبوو. لەمێژووی فەلسەفەدا بە تایبەتی لەسەدەمی ئەریستۆوە تاكو ئەمڕۆ دوابەدوای باسكردن لە كێشەی شوێن كێشەی (كات)یش دێتەكایەوە. ئێمە بە پێچەوانەی ئەم نەریتە فەلسەفیەوە، لە بەر ئەوەی بۆچوونەكانمان لە توێژینەوەی بوونی مرۆڤ جیاوازە پەیڕەوی ناكەین. هۆكاری ئەمەش لەوەدایە بیركردنەوەی فەلسەفی ئێمە لە(كات)ی فیزیكی نادوێ‌و باسی كاتی مرۆڤ یان ئاگامەندی(زوروان)دەكات. زوروان خولەی زەوی بەدەوری ڕۆژداو چركەكانی ژماردنی كاتە فیزیكییەكە نیەو تەوژمێكی ژووركێشی نەپچڕاوو بەردەوامی ئاگامەندییە. زوروان لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئاگامەندیدایە چونكە ئەم بوونە ناتەواوەو هەیەو نیەو هەوڵی گەیشتن بە تەواوكۆیی دەدات. زوروان كاتی مرۆڤانەیەو خولەی بوونی مرۆڤە.

بوونی مرۆڤ بوونی تاکە، ئەو بوونەیە، کە(من)ەو بە ئاگاوە مێژوو دادەهێنێ. مێژووش لە ناو جیهاندا ڕووداوەو جیهان پێشمەرجە بۆ بوونی من و داهێنانی مێژووش. مێژوو لەم ڕووەوە گۆڕانکارییەکانی بوونی منەو ناوەڕۆکی من پێکدەهێنێ. بوونی من لە ناو جیهاندا جارێکی دیکە بەلای پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی دیکەدا پەلکێشم دەکات و ئەو ڕاستیەم بۆ ئاشکرا دەکات من لە ناو جیهاندا لەگەڵ کەسانی دیکەدام و تەنانەت بە بێ ئەوان ناتوانم هەبم. بوونی ئەوان پێشمەرجە بۆ بوونی من و لەو ڕۆژەوە پەیدا بووم لەگەڵ ئەوان ژیاوم و تەنانەت بوونیان پێش بوونی من دەکەوێت. ئەمەش تەنیا کێشەیەکی لۆجیکمەندانە نیەو ئۆنتۆلۆجیانەشە چونکە تاك بەبێ کۆمەڵ نابێت. دەکرێت لە ڕوانگەیەکی فینۆمینۆلۆجیانەوە ئەمە دروست نەبێت یان بە پێچەوانەی بۆچوونەکەمانەوە کەسێك هەڵوێستی دوورەپەرێزی لە کۆمەڵەوەو ژیانی تەنیایی هەڵبژێرێت و ئەوکەسە، وەکو سۆفیەك ڕووبکاتە دەشت و دەرو پێویستی بە بوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتی نەبێت. ئەم هەڵوێستە فینۆمینۆلۆجیە دەبینرێت بەڵام ئۆنتۆلۆجیانە لێك نادرێتەوە. بوونی ئەوکەسەی ڕوودەکاتە دەشت و دەرو بە تەنیا دەژی پێویستی بە بوونی کەسانی دیکەیە، وەکو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی. ئەم پێشمەرجە پێویستیەکە لە ناو بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤدا. ئەگەر

مرۆڤ هەبێت ئەو مرۆڤە منداڵی دایك و باوكیەتیو بوونی ئەوان ئەم كەسەی پەیدا كردووە. بەم شێوەیە كەسانی دیكەو بوون لەگەڵیاندا پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجیە بەڵام هاتنە ناو بوونەوە لە خێزانێك و چینێكی تایبەتی كۆمەڵدا ڕاستیەكی فینۆمینۆلۆجیەو دەبێت بە فاكتۆرێكی چەسپاوو نەگۆڕ. من لە خێزانێكی وردە بۆرژوا لە كوردستان لە دایك بووم. ئەمە بووە بە خسڵەتێكی نەگۆڕ بۆ من. من خۆم ئەو خێزان و چینەم هەڵنەبژاردو ناتوانم بیگۆڕم بەڵام هەموو كاتێك ئەتوانم هەڵوێستی خۆم بەرامبەر خێزان و چینەكەم بگۆڕم و سەربەستانە هەڵسوكەوتی لەگەڵدا بكەم. من دەتوانم دژی بایەخەكان و كەلتوری چینەكەم بوەستم و بەرگری لە مافەكانی چینی كرێكار بكەم. ئەم هەڵوێستە ڕابردووی من ناسڕێتەوە بەڵام ئاماژەی ئەو خاڵەگرنگەش دەكات، كە مرۆڤ بەسەربەست و داهێنەر دادەنێت و نایخاتە ڕیزی هەبووەكان و ناوەڕۆكێكی پڕو چەسپاوی بەسەردا ناسەپێنێت. لەبەر ئەوەی مرۆڤ سەربەستە، ئەو هەڵوێستە خۆی هەڵیدەبژێرێت. هەڵبژاردن و بڕیاردان لەسەر هەڵوێستێك یان پڕۆژەیەك لە لایەن دەسەڵاتێكی دەرەكیەوە، هەرچەندە گۆڕانێكی بنەڕەتیش لە بوونی مرۆڤدا داهێنێت، مرۆڤ سەربەست ناكات.

دانانی بوونی كەسانی دیكە بە پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی لە هەمانكاتدا چارەسەری كێشەی سەلماندنی بوونی ئەوانمان بۆ دەكات. ئێمە بە

پێچەوانەی (دێکارت)ەوە گومان لە بوونی کەسانی دیکە ناکەین و بە دوای بەڵگەش بۆ سەلماندنی بوونیان ناگەڕێین. ئەمەش وابەستە بە توێژینەوەکەمانەوەو دانانی بوونی کەسانی دیکە بە پێشمەرج. بوونی ئێمە، لەم ڕووەوە، دەبێت بە بەڵگە بۆ بوونی ئەوان. مادامەکی من هەم، ئەوا بوونی من بوونی کەسانی دیکەش دەسەلمێنێت، چونکە من بە بێ ئەوان نابم. لە پێشتر ئەم بەڵگەیەمان بۆ سەلماندنی بوونی جیهانی دەرەکیش بەکارهێناو جارێکی دیکەش خۆمان لە گومانکاری و خۆ-کاری دوور دەخەینەوەو بۆچونەکەمان لەسەر زەویەکی ڕیالیستیانەو ئۆنتۆلۆجیانە ڕادەگرین. بوونی کەسانی دیکە، بەم شێوەیە، داکەوت یان دیاردەیەکی دەرەکی فینۆمینۆلۆجی نیە، بەڵکو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە.

لە مێژووی فەلسەفەدا، پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ بە زۆرانباری‌و ناکۆکی لێکدراونەتەوە. زۆرانبازییەکانیش هەر شێوازێکی هەبێت،(زۆرانبازی نێوان کۆیلەو خاوەن کۆیلە لای هیگڵ و زۆرانبازی نێوان چینە جیاوازەکان لای مارکس)بە دیاردەیەکی مێژوویی‌و فینۆمینۆلۆجیانە دەناسرێت. لەبەر ئەوەی ئێمە ئۆنتۆلۆجی پێش فینۆمینۆلۆجی‌و ئەپستمۆلۆجی دەخەین، ئەوا پێویستە ڕاڤەکردنێکی ئۆنتۆلۆجیانەش بۆ پەیوەندییەکان بکەین. ئایا زۆرانبازی نێوان کۆیلەو

خاوەن کۆیلە پەیوەندی بە بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤەوە هەیە یان ڕووداوێکی ناو مێژووە؟ من لێرەدا بە تەنیا باسی هیگڵ و مارکس دەکەم، چونکە ئەم دوو فەیلەسوفە جەخت لەسەر ئەم شێوە پەیوەندییە دەکەن. بە بیروڕای هەردووکیان زۆرانبازی ڕووداوێکی مێژووییەو فینۆمینەیەو هۆکاری خۆشی هەیە. لە هیچ نوسراوێکی ئەم دوو فەیلەسوفەدا ئاماژەی زۆرانبازی، وەکو بونیادی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ نەکراوە. بۆ نموونە لای هیگڵ مسۆگەر کردنی سەربەستی هۆکاری سەرهەڵدانی زۆرانبازییەکەیەو خۆ ئەگەر مرۆڤ بە تەنیا بژی یان بوونی کەسانی دیکە هەڕەشە لە سەربەستیەکەی نەکات ئەوا خۆی ناخاتە ناو جەنگێکی خوێناویەوە. بۆ مارکسیش سەرهەڵدانی موڵکیەتی تایبەتی هۆکارێکی ئەستوویی‌یەو(ماتەری)زۆرانبازی دەهێنێتە داکەوتەوە. مرۆڤ، وەکو زۆرانبازێك لە دایك نابێت، ژیان فێری زۆرانبازی دەکات.

ڕوونکردنەوەکەی ئێمە لە گەڵ بۆچوونەکانی هیگڵ و مارکس دا ناکۆك نیەو ڕوونکردنەوەکەمان خاڵی جیاکردنەوەی بونیادی ئۆنتۆلۆجی‌و دیاردەیەکی فینۆمینۆلۆجی دەخاتە بەردەم. ئەوانەی بە پێچەوانەی ئەمەوە لە هیگڵ و مارکس تێدەگەن پێویستە بەوردی فەلسەفەی ئەم دوو بیریارە بخوێننەوە. هەروەها ئێمە نکۆڵی لە زۆرانبازی، وەکو

شێوەیەکی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ناکەین، لە هەمان کاتدا بە بونیادی ئۆنتۆلۆجیشی دانانێین. کاتێك مرۆڤ دێتە بوونەوە بە نیگەرانیەوە مامەڵە لەگەڵ جیهان و کەسانی دیکەدا دەکات. ئەو خۆی بە کەسێکی جیهانیو کۆمەڵایەتی دادەنێت چونکە جیهان و کۆمەڵ یان بوونی لە ناو جیهان و کۆمەڵدا پێشمەرجن بۆ بوونی ئەو. لە بوونیشدا بە بەردەوامی مامەڵە لەگەڵ جیهان و کۆمەڵدا دەکات و ئەوان کاری تێدەکەن و ئەویش کار لە ئەوان دەکات. پەیوەندییەکەشی لە پێش ئەوەی ئەپستمۆلۆجیانە بێت و هەوڵی ناسینیان بدات بە نیگەرانیەوە بایەخیان پێ دەداتو خەمیان دەخوا.[72]نیگەرانی پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی ئەو. مرۆڤ نیە نیگەران نەبێتو لەو هەڵوێستەوە مامەڵە لە گەڵ دەوروبەرو کۆمەڵدا نەکات. دەشێت بۆ کەسێك نیگەران نەبین کە لە ئێمەوە دوورە یان نایناسین، بەڵام ئەمە هەڵوێستێکی فینۆمینۆلۆجیانەیە نەك ئۆنتۆلۆجیانە. لە ڕووی ئۆنتۆلۆجیەوە مرۆڤ بە نیگەرانیەوە پەیدا دەبێت، ئەنجا لە ڕووە فینۆمینۆلۆجیەکەوە، لەوانەیە هەڵوێستێکی دیکە بۆ خۆی هەڵبژێرێتو نیگەرانبوونی خۆی نەخاتە ڕوو. هەندێکجار مرۆڤ لە ئاستی کەسێکدا یان ڕووداوێکدا زیاتر یان کەمتر نیگەرانی خۆی پێشان دەدا، بەڵام ناتوانێت بەبێ نیگەرانی هەبێتو بژی. شێوازی نیگەرانی لە ئاستی دوو بابەتەکەدا دەگۆڕێت. نیگەرانی بۆ جیهان و

---

[72] Martin Heidegger. Op. cit., P. 237-

بابەتەکانی ناو جیهان نیگەرانی بۆ کەسانی دیکە نیە. مرۆڤ جیهان دەکات بە ئامێرێك یان کەلوپەلێکی بەردەستەکیو بۆ مەبەستێکی تایبەتیو پێویست بەکاری دەهێنێت، هاوکات کەسانی دیکە ناکرێن بە ئامێرو بۆ مەبەستێکی تایبەتیش بەکار ناهێنرێن. مرۆڤ هەمیشە کۆتاییەیە نەك ئامێرو وەسیلەو بابەتی بەردەستەکی. ئێمە بۆیە دژی کۆیلایەتیو چەوساندنەوەی مرۆڤ ڕادەوەستین چونکە چەوسێنەر لایەنە چەوساوەکە بە ئامێرو کەلوپەل دادەنێتو خسڵەتی مرۆڤانەی لێ دادەماڵێ. چەوسێنەر مرۆڤ دەکات بە ئامێرو وەسیلە بۆ گەیشتن بە پێویستیەکانی خۆی.

بەشی سێیەم

# داهێنان

بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ لە دوو خاڵدا خۆی لە بابەتە (هەبوو)ەکان جیا دەکاتەوە. یەکەم ئەم بوونە بە (نەبوون)یەوە پەیدا دەبێت و دووەم، ئاگامەندانە هەوڵی خۆ تەواو کردن دەدات. (نەبوون) لەم ڕووەوە ئەوە دەگەیەنێت، کە مرۆڤ بوونێکی پڕو تەواوی نیەو بە بێ ناوەڕۆك پەیدا دەبێت و هەوڵدەدات ناوەڕۆك بۆ خۆی دابهێنێت و بگاتە تەواوکۆیی. ئەگەر مرۆڤ بەو نەبوونیەوە پەیدا نەبووایەو ناوەڕۆکێکی لەپێشتری بدرابایە، ئەوا بوونی ئەمیش، وەکو هەبووەکان نەگۆڕ دەمایەوەو دەزانرا چیە. لەم پێگە نیهێڵسیتەوە، کە لەپێشتر لەسەر ناوەڕۆکی ئەم بوونە پەیڕەوییمان لێ کردووە، دەگەینە ئاکامێکی گرنگ و دەستەڵاتی (داهێنان) بە مرۆڤ دەدەین. مرۆڤ، بەبێ دەستەڵاتی داهێنان، تواناو بڕستی نابێت بوونی ناتەواوی خۆی تەواو بکات و بگاتە تەواوکۆیی. لە بەر ئەمەو لە ئاکامێکی لۆجیکمەندانەی توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەمان داهێنان بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ دادەنێین. نکۆڵی

کردن لەم ڕاستیەش گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجیانە لە ناو بوونی مرۆڤدا دەهێنێتە کایەوەو (نامۆ)ی دەکات. بەڵام بۆ ئێمە نامۆیی، ئەگەر لە ئەنجامی ئەم ڕەتدانەوەو نکۆڵیکردنەشەوە سەریهەڵدابێت، دیاردەیەکی مێژوویی‌یە. داهێنان و نامۆیی پەیوەندیەکی ناکۆکیان هەیە. کەسێکی نامۆ بە داهێنەر دانانرێت چونکە ناتوانێت خۆی بڕیار لە سەر پڕۆژەکانی بوونی بدات. بڕیاردانەکە دەکەوێتە سەر دەستەڵاتێکی دەرەکی، کە ئەم بوونەی داگیر کردووە. بەستنەوەی نامۆیی بە مێژووەوە یان دانانی بە دیاردەیەکی مێژوویی ئێمە لە مارکس نزیکدەکاتەوەو لە (هیگڵ)یش دوورماندەخاتەوە. هیگڵ، بە پێچەوانەی ئێمەوە، نامۆیی بە دیاردەیەکی پێویستو ناچار بینیوە. بۆ ئەم فەیلەسوفە ئاگامەندی ناتوانێت خۆی لە نامۆیی ڕزگار بکات و بە ناچاری تیایدا دەژی و لەو ئەزموونەوە لە ناو گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوودا هەوڵدەدات لە دوا قۆناغی گەشتەکەیدا خۆی بناسێتەوەو مکۆی گرانی نامۆیی لە سەر شانی خۆی لابەرێت. هەروەها، هیگڵ هەموو شێوازێکی لێکدابڕان بە نامۆیی دادەنێ. بۆ نموونە لە بەر رۆشنایی ئەم بۆچوونەدا منداڵبوون شێوازێکی نامۆیی‌یە چونکە منداڵەکە لە دایکەکەی دادەبڕێ و جیا دبێتەوە.

کاتی ئەوە هاتووە لە خۆمان بپرسین داهێنان چیە؟ بەچی دەوترێت داهێنان؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە جارێکی دیکە جەخت لەسەر ئەو خاڵەدەکەینەوەو دەڵێین دهێنان پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤە. ئەو بونیادەی بوون و نەبوونی لەناو خۆیدا گرێچن کردووەو مرۆڤی کردووە بە هەیەو نیە. مرۆڤ (هەیە)، چونکە دەژیو دەستەیەك فاکتۆریش بە بوونیەوە نوساون و هەندێك پرۆژەشی بە ئەنجام گەیاندوە. ئەو، لە هەمانکاتدا (نیە)و خۆی تەواو نەکردووەو لە داهاتوودا دەبێ بەوەی، ئێستا نیە. لەم گەشتەیدا لە نەبوونەوە بەرەو بوون ناوەڕۆکی خۆی دادەهێنێت. ناوەڕۆکی دەبێت بەو پرۆسەی داهێنانە پرۆژەکان لە نەبوونەوە بەرەو بوون پەلکێش دەکات. ئەگەر پرۆژەیەك ئەم پێناسەیەی بەسەردا نەبڕێ ئەوا بەداهێنان دانانرێت. بۆ نموونە ئیسماعیل خەیات بە هونەرمەندی لە دایك نەبووە. بوون بە هونەرمەند پرۆژەیەکەو ئیسماعیل خەیات ئاگامەندانە بڕیاری لەسەرداوەو بە ئەنجانی گەیاندووە و لە نەبوونەوە پەلکێشی کردووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت پرۆژەی هونەرمەندی بوونێکی دراوی لە پێشتری نەبووەو هونەرمەندەکە خۆی دایهێناوە. هەموو پرۆژەیەك لە بوونی مرۆڤدا، کە مرۆڤ بڕیاری لەسەر دەدات لە پێشتر نەبووە. داهێنان، پرۆسەیەکی بەردەوامە لە نەبوونەوە بەرەو بوون لە پێناوی خۆ تەواوکردنی ئەم بوونەدا دەکەوێتەگەڕ. ناتەواوی

کەمی بوون دەسەلمێنێت و ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەخات، کە مرۆڤ بە نەبوونی‌یەوە ژیانی دەست پێدەکات.

هەموو پڕۆژەیەك لە پڕۆسەی داهێناندا لە نەبوونەوە بۆ بوون سەر هەڵدەدات. پڕۆژەیەك بەم شێوەیە پەیدا بکرێت یان بەرهەم بهێنرێت داهێنانە. لەبەر ئەمە داهێنان فرە شێوازەو هەر شێوازەش بایەخی تایبەتی خۆی هەیە چونکە پڕۆژەکانی بوون فرەن. بەڵام لەسەرو هەموویانەوەو داهێنان بەواتا گشتیو فەلسەفیەکەی داهێنانی ناوەڕۆکەو دەبێت بە زەمینەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ شێوازەکانی دیکە. ئەگەر مرۆڤ لەبنەڕەتەوە(بە گوێرەی بونیادی ئۆنتۆلۆجی) داهێنەر نەبێت و نەتوانێت بڕیار لەسەر ناوەڕۆکی خۆی بدات ناتوانێت بۆ نموونە پڕۆژەی بە شاعیر بوونیشی بۆ خۆی هەڵبژێرێ. لەم گۆشە تێڕوانینەوە توێژینەوەکەمان شێوازێکی فەلسەفی وەردەگرێو ڕێگەش بۆ شێوازەکانی دیکە تەخت دەکات. بێجگە لەمەش لەبەر ئەوەی توێژینەوەکەمان پەیوەندییەکی پێویستی لۆجیکمەندانەی بە سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەمانەوە هەیەو مامەڵە لەگەڵ بوونی مرۆڤدا دەکات هەموو مرۆڤێك لە بنەڕەتەوە بە داهێنەر دادەنێت.

تابلۆیەکی هونەری، کە هەڵقوڵاوی بیری هونەرمەندەکەیە، بابەتێکی دەرچووە یان هیگڵ گوتەنی نامۆیە. بەڵام ئێمە بەم جۆرە لە واتای

نامۆیی ناکۆڵینەوەو پێناسەی (نا-خۆ)یی یان (نا-ڕەسەنی)بۆ دادەتاشین. نا-خۆیی لەوێدایە تاکێك بوونی لە لایەن دەسەڵاتێکی دەرەکیەوە داگیرکرابێت و نەتوانێت خۆی بڕیار لەسەر پڕۆژەکانی بدات. بوونی نامۆو نارەسەن لە هەمانکاتدا لە بەر ئەوەی دەسەڵاتی داهێنانی تاك زەوت دەکات، بوونی مرۆڤ دەکات بە هەبوو. لە ناو ڕابردوو ئێستادا دەیخنکێنیو ڕێگە نادات ڕوو لە داهاتوو بکات، چونکە داهاتوو گۆڕەپانێکی بەرین و بەربڵاوی پڕۆژە بە ئەنجامنەدراوەکانە، کە هێشتا مرۆڤ داینەهێناون. لێرەشەوە، لە ڕوونکردنەوەی پەیوەندی ناکۆك و نالەباری نێوان داهێنان و نامۆییدا پەیوەندییەکی هاودەنگیو پۆزەتیڤانە لە نێوان داهێنان و ڕەسەنی بووندا هەڵدەبەستین. بێگومان فەیلەسوفە بوونخوازەکان بەگشتیو هایدیگەرو سارتەر بە تایبەتی جێگەیەکی تایبەتمەندیان بۆ داهێنان لە نێو فەلسەفەکەیاندا داناوە، بەڵام ئەم فەیلەسوفانە، وەکو ئێمە (داهێنان)یان بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی دانەناوەو ئەو ڕاستیەیان باس نەکردووە، کە بەبێ ئەم پێشمەرجە مرۆڤ ناتوانێت خۆی تەواو بکات.[73] (داهێنان)لای فەیلەسوفە ئایدیالیستەکان و ئایینیەکانیش بە دەسەڵاتی بوونێکی پڕو ڕەها دانراوە.[74]

---

[73]- مارتن هایدیگەر لە لێکۆڵینەوەکانیدا لەسەر بەرهەمی هونەری نەك لە سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا باسی داهێنان دەکات.

[74]- ئەمە بیروڕای هەموو فەیلەسوفە ئایدیالیستەکان نیە. ئەفلاتون و ئەریستۆ، بۆ نموونە، لەو باوەڕەدان سەدەمی یەکەم دەسەڵاتێکی جوڵێنەرەو(فۆڕم)ی کردووە بە بەری(ئەستو)دا.

بوونی ڕەها(سەدەمی یەکەمی ئەریستۆو بوونی تەواوکۆیی دێکارت)پڕو تەواوەو لە کەمی بەدەرەو (پێویستی) بە هیچ نیە. بوونێکە، بە گوێرەی ئەم زانایانەو ئایینەکانیش، بەو پڕیەوە هەیە، وەکو مرۆڤ بە نەبوونی‌یەوە ناژی. ئایا بوونێك بەم شێوەیە پڕو تەواو بێت دەبێ چی دابهێنێت؟ لە توێژینەوەکەماندا ئاماژەمان بۆ نەبوونی بوونی مرۆڤ کردو وتمان بەبێ ناوەڕۆك پەیدا دەبێت. ئەم (پێویستی)یە، یان خۆ تەواوکردنە دەمانگەیێنێتە ئەو باوەڕەی، ئەگەر مرۆڤ داهێنەر نەبێت ناتوانێ خۆی تەواو بکات. داهێنانیش دەبێت بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی ناتەواوی ئەو. ئەگەر بوونی مرۆڤ وەکو سەدەمی یەکەمی ئەریستۆ پڕو تەواوکۆ بوایە داهێنەریش نەدەبوو، چونکە داهێنان(پێویستی) بوونێکی ناتەواوە. بەم شێوەیە توێژینەوەکەمان لەمەڕ داهێنان شێوازێکی فەلسەفی وەردەگرێت و ڕێگە بۆ شێوازەکانی دیکەش خۆش دەکات. ئێمە لە کێشەی داهێنانی تاکەکەسێك ناکۆڵینەوەو دەمانەوێت بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ داهێنان ڕەنگڕێژ بکەین. ئەم بناخەیەش بەستراوە بەو توێژینەوەیەوە، سەبارەت بە بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤ لەسەری دواوین و پەیوەندییەکی پتەویش لەنێوانیاندا دەستنیشان دەکەین. لە سەرەتاوەو لە گۆشەنیگای ڕوونکردنەوە ئۆنتۆلۆجیەکەمانەوە نەك تاکەکەسێك یان چەند ئەندامێکی کۆمەڵ، بەڵکو مرۆڤ بەگشتی بە داهێنەر دادەنێین.

ڕەتدانەوەی ئەم ئاکامەش لادانە لەو بونیادە ئۆنتۆلۆجیەی بوونی مرۆڤ و بە نا- مرۆڤکردنی مرۆڤە.

داهێنانی هونەری و شێوەکانی دیکەی داهێنان خاوەنی بەهای جیاوازو مەبەستی جیاوازن. بەڵام هەموویان داهێنانن و بە بەرهەمی ژیرو ئاگامەندی دادەنرێن. لە هەمانکاتدا هەموو بەرهەمێك داهێنان نیە. جووتێك پێڵاو لە جامخانەی دوکانێکدا بۆ فرۆشتن دادەنرێت داهێنانی هونەری نیەو کەچی تابلۆی (پۆستاڵەکان)ی ڕوشدی ئەنوەر داهێنانی هونەری‌یە. ئایا جیاوازی نێوان شێوازەکانی داهێنان چیە؟ ئەو بەهایانە کامانەن، کە شێوازەکان لە یەکدی جیادەکەنەوە؟ پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە دەمەوێ ئەو خاڵە گرینگە ڕونبکەمەوە، کە توێژینەوەکەمان لەسەرەتاوە لەمەڕ داهێنان بایەخ بەو بۆچوونە دەدات داهێنان بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوون و ناوەڕۆکی بوون دادەنێ. پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە دێینە سەر باسی شێوازەکانی داهێنان.

بەگوێرەی ڕێچکە فەلسەفیەکەمان بوونی مرۆڤ بەبێ ناوەڕۆك ڕسکاوەو دەبێت خۆی هەوڵ بۆ پەیداکردنی ناوەڕۆکی بدات. ئەم کارەش بە هۆی(داهێنان)ەوە بە ئەنجام دەگات. داهێنانی ناوەڕۆك، وەکو پێویستیەکی ئۆنتۆلۆجی شێوازی دەربڕین و دەرخستنی ناوەڕۆکیش

دیاریدەکات. حەزو ئارەزوو بیرو باوەڕی مرۆڤ بە سەر جیهانی دەرەکیەوە تۆمار دەکات و ئەو جیهانە بۆ بابەتە ویستراوەکان دەگۆڕێ. (پێویستی) داهێنانی ناوەڕۆك لە شێوازەکانیدا مرۆڤ دەکات بە داهێنەرو بەرهەم هێنەر هەر یەکێك لەمانەش شێوازی دەربڕینی بوونە. هیگڵ پرۆسەی داهێنان، هەرچەندە(پێویستی)یە، بە نامۆ بوون دەخوێنێتەوەو لەو باوەڕەدایە دەرچوونی بەرهەم لە پرۆسەکەداو بەرهەمەکە، کە هەڵقوڵاوی بیرۆکەی خۆیە، لە داهێنەرەکە دادەبڕێو داهێنەرەکەش لەو نامۆ دەبێت.
مارکس یەکەم بیریارە رەخنەی لە بۆچوونەکەی هیگڵ گرتبێت و بە دیدی ئەم لەکاتێکدا بەرهەمهێنەر لە بەرهەمەکەی نامۆ دەبێت، کە بەرهەمەکەی لەلایەن کەسێکی دیکەوە داگیربکرێت و خاوەنەکەشی پێبچەوسێندرێتەوە. بۆ نموونە، بە بینینی مارکس، لە کۆمەڵگای سۆسیالیستیدا لە بەر ئەوەی بەرهەمی کرێکار لە لایەن چینێکی دیکەی کۆمەڵەوە داگیرناکرێت و کرێکاریشی پێ ناچەوسێنرێتەوە ئەو جۆرە نامۆییە دەفەوتێت و چارەسەر دەکرێت.

لە کاتێکدا داهێنان ڕاستی(بوون) ڕادیکالانە بە هێزەوە دەردەبڕێ، وەکو بەرهەمهێنانی کرێکار ڕوو لە بایەخی پراکتیکی ناکات، بە داهێنانی هونەری دادەنرێت. لە کڕینی جووتێ پێڵاودا بیر لە باشیو خراپی ئەو بەرهەمە دەکەینەوەو ئەمەش نابێت بە هاندەرێك بۆ گەڕان بە شوێن

وەستاکەیدا یان ناوی ئەو کرێکارەی لە کارخانەکەدا هێناویەتیە بەرهەم. من نالێم بوونی پێڵاوەکە بیرکردنەوەم بەلای کرێکارو کارخانەو...هتد نابات، بەڵام زۆرم لێناکات داهێنەرەکەی بناسم. داهێنەرەکەش (کرێکارەکە) چاوەڕوانی بڕوانامە لە من ناکات. کەچی لە بینینی تابلۆیەکی هونەریدا یان خوێندنەوەی هۆنراوەیەکدا کۆمەڵێك پرسیار سەبارەت بە دەربڕینی (ڕاستی)بوون و ناسنامەی داهێنەرەکەوە یەخەمان دەگرێت. لێرەدا بیر لە بایەخی پڕاکتیکی تابلۆکە یان هۆنراوەکە ناکەینەوەو دەمانەوێت بزانین تاکوو چ پلەیەکی سەرکەوتوو بەرهەمە هونەرییەکە ڕاستیی بوونی بۆ کردووین بە دیاردەیەکی ناسراو. ڕوونکردنەوەی داهێنانی هونەری لە ڕەهەندی پڕاکتیکی ئەوە ناگەیەنێت داهێنانی هونەری بێنرخەو هونەر بۆ هونەرە. بە بیروڕای ئێمە هونەر بۆ هونەر بێواتایە چونکە داهێنان بۆ داهێنان نیەو هەموو داهێنانێك مەبەستێکی دیاریکراوی بۆ تەواو بوونی بوونی مرۆڤ بە بەر خۆیدا دەکات. مرۆڤ هەرچی دابهێنێ دەیەوێ بەو داهێنانە ناوەڕۆکی خۆی پڕبکاتەوە. بێجگە لەمەش، داهێنانی هونەری، بە پێچەوانەی بەرهەمی کرێکارەکەوە، بوونی داهێنەرەکەش وەکو(تاك) دەسەپێنێ. لە تەماشاکردنی تابلۆکەدا یان خوێندنەوەی هۆنراوەکەدا دەمانەوێ داهێنەرەکەشی بناسین.

جیاکردنەوەو پۆلێن کردنی شێوازەکانی داهێنان وابەستن بەبۆچوونە ئۆنتۆلۆجیەکەمانەوە. هەموو کەسێك داهێنەرە بەڵام هونەرمەند نیە. هونەرمەندی خسڵەتێکی پێدراوو زکماکیش نیەو دانانی پڕۆژەی هونەرییە و شێوازی تایبەتمەندی خۆی هەیە. گەڕانەوەی داهێنانی هونەری بۆ سەرچاوەیەکی پێدراو و لە پێشتر لەگەڵ تویژینەوەکەمان ناکۆکە. داهێنان پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونەو شێوازەکانی فینۆمینۆلۆجیانە شیدەکرێنەوەو دەناسرێن و مێژوویین. لەم ڕووەوە مێژوو داهێنان و گەیشتنە بە تەواوکۆیی. داکەوتی مێژوویی داهێنانی پڕۆژەکانە. بوون و نەبوون، بوون و ناوەڕۆك، بوون و داهێنان لە ناوخۆیدا دەپێچێتەوە و پردی پەیوەندییان لە نێواندا هەڵدەبەستێ. بەستنەوەی بوون بە مێژووەوە ئاماژەی بوونێکی ناتەواومان بۆدەکات، کە تاکو تەواو نەبێت پێناسەکردنی دژوارە. چونکە هێشتا خۆی تەواو نەکردووەو هیچکام لە قۆناخەکانی پڕۆسەی خۆ تەواوکردن یان پڕۆژەیەکی داهێنراو بە تەنیا بەبێ ئەوانی دیکە بوونی ئەو پێناسە ناکەن. من دەتوانم شاعیریی (نالی) پێناسە بکەم چونکە ئەم شاعیرە نەماوە تاکو لە داهاتوودا پڕۆژەی نوێتر دابهێنێ. بەڵام ناتوانم پێناسی(شاعیری) شاعیرێکی زیندوو بکەم لە بەر ئەوەی پڕۆژەکانی تەواو نەبوون و کۆتایی بە داهاتووی نەهاتووە. بوونی کەسێك ناخرێتە بەر ڕۆشنایی دیاردەیەکەوەو لەوێوە واتاکەی ڕوونبکرێتەوە.

مرۆڤ بیەوێ و نەیەوێ، مادامەکی بە ناتەواوی ڕسکاوە دەبێ داهێنەر بێت بۆ ئەوەی خۆی تەواو بکات. کاتێکیش نکۆڵی لەم ڕاستیە دەکرێت بوونی مرۆڤ و ڕۆڵی گرنگی ئەو لە ناو مێژوودا ڕادەگیرێو نامۆ دەکرێ. ئەم ڕاستیەش بانگەشەی ئەوە ناکات هەموو کەس شاعیرە یان هونەرمەندە بەڵام داهێنەرەو نابێت ڕۆڵی مێژوویی خۆی وونبکات. دەبینین ئەمڕۆ لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا دەسەڵاتی داهێنان تا ڕادەیەك خەفەکراوە. شێوازی بەرهەمهێنانی تەکنۆلۆجی، کە بناخەی مێتافیزیکی خۆی هەیە، ژینگەیەکی پڕ کەرەسەو ئامێری ئامادەکراوی خستۆتە بەردەست و بە زۆر بەسەر تاکدا سەپاندویەتی. خەفەکردنی دەسەڵاتی داهێنان تاکەکانی تووشی(خۆ لەبیرچوونەوە)و(خۆ-ونکردن)کردووە. لەژێر دەسەڵاتی تەکنۆلۆجیادا چاوەڕوانی ژیانێکی ئارامترو بێتێکۆشان دەکرێت و ژیانی تاکەکان بە کەرەسەکانەوە مەحکوم دەکرێت. لە بەکارهێنانی تەکنۆلۆجیادا تاکەکان بیر لە پرۆژەی داهێنان و خۆ تەواوکردن ناکەنەوەو دوای پەیداکردنی کەرەسە ئامادەکراوەکان دەکەون و لە داهێنەرەوە دەبن بە کڕیارو بەختەوەریو خۆشی بە کەرەستەکانەوە دەبەستنەوە. بەکارهێنانی دەستکەوتی زانستی لە پێناوی بەختەوەر بووندا ڕەوایە، بەرەنگاریکردنمان لەگەڵ بەکارهێنانەکەدا لەو گۆشەنیگا فەلسەفیەوە سەرهەڵدەدات، کە بیرکردنەوەی زانستیانەو تەکنۆلۆجیا بوونی مرۆڤیش، وەکو کەرەستە دادەنێت و بۆ کەڵك لێوەرگرتنی خۆی داگیری

دەکات. لەو کۆمەڵگایانەی تەکنۆلۆجیا ئاسمان و ڕێسمانی لێ تەوقکردوون تاکەکانی کۆمەڵیش بە کەلوپەل و سامان دادەنرێن و بۆ بەرژەوەندی لە بازاڕدا هەڵدەسورێن. تاك بە قەد دەسەڵاتی سود(کەڵك)گەیاندن و بەرهەم هێنانی بۆ ئەو سیستەمە تەوقدارە بایەخی بۆ دیاریدەکرێت و نرخی بۆدادەنرێت. لەگەڵ نەمانی دەسەڵاتەکەیداو وەستانی بەرهەمەکەی دەخرێتە ڕیزی ماکینەیەکی لەکار کەوتوو. لە بەهەشتی تەکنۆلۆجیادا(بوون) شتەو بایەخی بەکەڵکی(بەهای سودمەندی) بەسەردا داکوتراوە. بە(شت)بوون گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجیە لەم بوونەداو سڕینەوەی جیاوازییەکانیەتی لەگەڵ هەبووەکاندا.

بۆ ڕوونکردنەوەی واتای داهێنان جارێکی دیکە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو خاڵەی داهێنانی بە خسڵەتێکی مرۆڤانە پێناساندیین و نکۆڵی لەوەش کرد، کە بوونێکی پڕو تەواو خاوەنی داهێنان بێت.

ناتەواوی بوون پێشمەرجە بۆ داهێنان و داهێنانیش بۆ خۆ- تەواوکردن. هەرچەندە گەیشتن بەم ئاکامە کاریگەری هایدیگەری پێوە دیارە، با ئەو خاڵەشمان لە بیرنەچێت ئێمە کوێرانە لاسایی(هایدیگەر)مان نەکردۆتەوەو شوێن بیروباوەڕی نەکەوتووین. هایدیگەر داهێنان بە پێشمەرجێکی

ئۆنتۆلۆجی دانانێت، کە بەبێ داهێنان بەبیروڕای من کەموکورتیەکی زۆر دەکەوێتە ناو شێوازی ئۆنتۆلۆجیەکەمان بۆ بوونی مرۆڤ. داهێنان هەرچەندە لە ناو مێژوودا ڕوودەدات، لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤدایە. بونیادێك، کە نەبوونی بە بوونیەوە گرێدراوەو لێی جیانابێتەوە. بوونێکی ناتەواو هاوکات بەبێ داهێنان ناتوانێت خۆی تەواو بکات و کەللەبەرە بۆشەکانی بوونی پڕبکاتەوە. کەسێك لەو باوەڕە دابێت مرۆڤ داهێنەر نەبێت، بڕیار لەسەر بوونێکی پڕو تەواو بۆ مرۆڤ دەدات و ئەمەش لەگەڵ هەیەو نیەی ئەم بوونەدا ناگونجێت.

پێشتر بەو شێوەیە باسی داهێنانمان کرد، کە بوونێك لە نەبوونەوە پەلکێش دەکات. هەروەها لەزۆر شوێنیشدا جەختمان لەسەر ئەو خاڵە کرد مرۆڤ ناوەڕۆکێکی نەگۆڕو لە پێشتری نیە. ئەو بەبێ ناوەڕۆك پەیدا دەبێت و خۆی ناوەڕۆك بۆ خۆی دادەهێنێت. ناوەڕۆکی چی بێت و چۆن بێت خۆی دایهێناوەو پڕۆژەیەکی بە ئەنجامدراوی لەوەو پێش نەبووە. بوون بە شاعیر، پڕۆژەیەکە لەوەو پێش نەبوەو تاکێك لەو نەبوونیەوە بڕیاری بوونی دەدات. بوون بە شاعیر بەهرەیەکی لە ئاسمانەوە پێدراو نیەو کەلوپەلیش نیە لە بازاڕدا بفرۆشرێت. ئەوکەسەی دەیەوێت ببێت بە شاعیر خۆی بڕیار لەسەر شیعر نووسین دەدات. پێش ئەوەی (نالی)شیعر بهۆنێتەوە، بە شاعیر نەدەناسرا. بوون بەشاعیر پڕۆژەیەکی داهێنراوی (نالی)یە لە

(نەبوون)ەوە بۆ بوون پەلکێش کراوە. هەموو پڕۆژەکانی بوون، کە بڕیاریان لەسەر دەدرێت نین و پەیدا دەبن. داهێنان بەم جۆرە پەیداکردنی بوونێکی نادیارو نەناسراوەو دۆزینەوەی ڕاستیەکی لەوەو پێش نەزانراوە. ئەگەر داهێنان خۆی لەم خسڵەتە ناوەڕۆکییە دوور بخاتەوە بە داهێنان دانانرێت.

داهێنان پرۆسەیەکی بەردەوامەو ڕاستی ناسە. گۆڕانکاری لە بوونەوە بۆ بوون پێناسەی داهێنانی بەسەردا نابڕێ. کەسێك جارێك دەبێ بە شاعیر، ئەگەر ئەو کەسە شاعیر بێت جارێکی دیکە پڕۆژەی بوون بە شاعیر هەڵنابژێرێت. داهێنان لە نەبوونی شاعیر بوونەوە بۆ شاعیر بوونە. بە تەنیا ئاگامەندی خاوەنی پرۆسەی داهێنانیشەو هەبووەکان، وەکو مێزو درەخت و ئەسپ دەسەلاتی داهێنانیان نیەو ناوەڕۆکێکی پڕو نەگۆڕیان بەسەردا سەپێنراوە. هەبووەکان بێ پڕۆژەن و لە داهاتوو بەدەرن و(کات)بۆ ئەوان لە(ئێستا)دا ڕاوەستاوە.

داهێنان شێوازی جۆراوجۆری هەیە، بەڵام هەموویان بۆ تەواوکردنی بوونی مرۆڤ دەکەونەگەڕ. داهێنانی هونەری لە داهێنانی پڕۆژەیەکی زانستیانە یان ئابوورییەوە جیاوازەو خاوەنی بایەخی تایبەتی خۆیەتی. دۆزینەوەی نرخی جوانی لە پڕۆژەیەکی زانستی و ئابووریدا شیاو نیەو چاوەڕوانی بەهای پڕاگماتیکیش لە تابلۆیەکی هونەری و کۆپلە

هۆنراوەیەك ناكرێ. شێوازەكانی داهێنان لە چۆنیەتی كارتێكردنیشدا بۆ سەر بیركردنەوەمان دەگۆڕێن. لەبەر ئەوەی داهێنانی هونەری ڕۆڵی خۆی بۆ دەرخستنی ڕاستیەكی نەناسراو تەرخان دەكات كارتێكردنێكی ڕاستەوخۆی بەسەر بیركردنەوەمانەوە هەیەو توشی هەڵچوونی ویژدانیمان دەكات. دۆزینەوەی ڕاستی نەناسراو لەم ڕوونكردنەوەیەدا لادانێكی ئاشكرایە لە بۆچوونەكانی (ئەفلاتون)و(هیگڵ)ەوە سەبارەت بە هونەر. بۆ ئەفلاتون جیهانی ئێمە كۆپی جیهانێكی بەرزو لە ئەستو بەدەرو نەگۆڕەو هەرچیەك لەم جیهانەدا هەبێت دروستكراوە. لە میتافۆری (ئەشكەوت)دا ئەفلاتون باشتر ئەم كێشەیەی بۆ ڕوونكردوینەتەوەو گوایە ئەوانەی لەناو ئەو ئەشكەوتەدا دەژین، لە بەر ئەوەی دەرەوەی ئەشكەوتەكەیان نەبینیوە شتەكانی ناو ئەشكەوتەكەو سێبەری جولاوی بابەتەكانی دەرەوە لەسەر دیواری ئەشكەوتەكە بەڕاست دادەنێن.[75] بیردۆزەی ئۆنتۆلۆجی ئەفلاتون كارتێكردنی خۆی بەسەر هونەرەوە جێهێشتوە. بەرهەمێكی هونەری، وەكو بەرهەمەكانی دیكە دەچنە ڕیزی لاسایی كردنەوە. مێزەكەی بەردەمم ، كە بابەتێكی هەندەكیە، كۆپی فۆرمی مێزی هەمەكی ناو جیهانە بەرزەكەیەو بەمێزی (ڕاست) دانانرێت. ئەگەر هونەرمەندێك نەخشەی مێزەكەمان لە تابلۆیەكدا بۆ بكێشت، ئەو لە تابلۆكەیدا لاسایی مێزەكەی كردۆتەوەو مێزەكەش كۆپی فۆرمە هەمەكیەكەیەتی. تابلۆی مێزەكە

[75] - Plato. *The Republic*, in the Essential Plato, translated by B.Jowett, New York: Quality paperback Book Clob,1999. P. 265

دەبێت بە لاسایی کردنەوەی لاسایی کردنەوەو هونەرمەندەکە ناتوانێت لافی داهێنەر لێبدات. پاش ئەفلاتون هیگڵ هەوڵیداوە بیردۆزێکی هونەرییمان بخاتە بەردەم و ئەمیش بیردۆزەکەی بەسیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەیەوە گرێداوە. لە بەر ئەوەی فەلسەفە بۆ هیگڵ داستانی نامۆیی ئاگامەندییە لە جیهانی دەرەکیەوە، یان ئاگامەندی لە ئەستو، مێژوو دەبێت بە سەکۆی زۆرانبازی ئاگامەندی و داگیرکردنی ئەستو. لەم زۆرانبازییەدا ئاگامەندی دەیەوێت بچێتە ناو ئەستووەو بیکات بە کۆشکی خۆیو ناوەڕۆکی بداتێ.

بۆ وەدەستهێنانی ئەم مەبەستە ئاگامەندی بە چەند قۆناخێکی جیاوازو لێك نەپچڕاو خۆی لە ناو ئەستودا دەردەخات و لە دوا قۆناخەکانیا وەکو هونەرو ئایین و فەلسەفە دەستکەوتەکەی دەکاتە سەرمایە. لە بەر ئەمە بەرهەمی هونەری لە ڕوانگەی ئەم زۆرانبازییەی نێوان ئاگامەندیو ئەستو، فۆرم و ناوەڕۆکی پێدەدەرێت. هەر کام لەمانەش دەگەڕێنەوە بۆ لایەنە دژەکان. لە لایەکی دیکەوە، هیگڵ هونەری بەکەمتر لە ئایین و فەلسەفە داناوەو ئەمەش بەستراوە بە نزیکی هونەر لە جیهانی ئەستووەوە.[76] پاش هونەر ئایین و فەلسەفە بەتەواوی ئاگامەندی لە ژێر کارتێکردنی ئەستو دەپارێزن و جیهان دەکەن بە کۆشکی ئاگامەندی و

[76] G. F.W. Hegel. *Encyclopaedia of the Philosophical Sciences*, Ernst Behler(ed.), New York: Continuum, 1990. PP. 258-260

یەکیەتی‌یەکی تەواو لە نێوان دوولایەنە دژەکە دروست دەکەن. ئاگامەندی دەگاتە ئەو باوەڕەی، کە بێجگە لە خۆی چیدیکە نیە. ئەوەی شایانی باسە، هیگڵ، وەکو ئەفلاتون هونەری بە لاسایی کردنەوە دانەناوە، چونکە سیستەمی ئۆنتۆلۆجیان لە یەکدیەوە جیاوازن. بۆ هیگڵ ئاگامەندی تەنیا ڕاستی‌یەو لە گۆڕان و جوڵانێکی دیالێکتیکیدا بۆ لە ناو بردنی نامۆییەکەی هەوڵدەدات و دەیەوێت بوونی سەربەخۆیی ئەستو ڕەتبکاتەوەو بیکات بە موڵکی خۆی‌و خۆی تێدا دەربڕێ. یەکێکیش لەو شێوە دەربڕینانەی ئاگامەندی لە ناو ئەستودا یان خۆ دەرخستنی *Scheinen* بەرهەمی هونەرییە. لەم بۆچوونەشەوە دەتوانین بڵێین تاکی هونەرمەند بووە بە ناوەندێك بۆ دەربڕینی ئاگامەندی ڕەهاو خۆدەرخستنی لە ناو ئەستودا.

ئەو خاڵەی ئێمەو هیگڵ کۆدەکاتەوە خۆ دەرخستنی ئاگامەندییە لە بەرهەمی هونەرییدا. بەڵام لە سێ خاڵی دیکەدا لە هیگڵ دووردەکەوینەوە؛ یەکەم، ئێمە داهێنانی هونەری تاك بە ناوەندێك بۆ دەربڕین و خۆدەرخستنی ئاگامەندی (ڕەها) *Geist* دانانێین. دووەم، هیگڵ بایەخ بە ڕۆڵی تاکەکان نادات و ئاگامەندی بۆ ئەو هەمەکی‌و ڕەهایە. سێیەم، ئێمە هونەر لە ئایین و فەلسەفە نزمتر ڕاناگرین و بە

داهێنانێکی ڕادیکاڵی، وەکو فەلسەفەی دادەنێین، کە ئەویش ڕادیکالاّنە ڕاستی نەناسراو دەدۆزێتەوە.

وەکو باسمانکرد، داهێنانی هونەری دۆزەرەوەی ڕاستیەو بوونێك لە نە بوونەوە دەخاتە بەر ڕۆشنایی زانین و لە هەمان کاتیشدا بوونی داهێنەرەکەمان بۆ زەقدەکاتەوە. من هەموو ڕۆژێك مێزەکەی ناو ژوورەکەم بەکاردەهێنم، مێزەکە بوونی وەستاکەم بە زۆر بەسەردا ناسەپێنیو ئەو پرسیارە لە خۆم ناکەم کێ دروستیکردوە. کەچی تەماشاکردنی تابلۆیەك یان خوێندنەوەی هۆنراوەیەك بەرەو لای داهێنەرەکەی ڕامدەکێشێ. بەم شێوەیە داهێنانی هونەری دوو جۆر بوونمان بۆ دەردەخات؛ بوونێکی نە ناسراو یان لە پێشتر نەبوو، هەروەها بوونی داهێنەرەکە. تابلۆی (پۆستاڵەکان)ی ڕوشدی ئەنوەر لەلایەکەوە ڕاستی بارودۆخێکی نالەبارمان بۆ دەردەخات، کە مرۆڤ بە زۆر تێیدا فرێدراوەو لە لایەکی دیکەوە داوای بڕوانامەمان بۆ داهێنەرەکەی لێدەکات. (دەربەندی پەپوولە) داکەوتێکی تاڵ و وێرانبوونمان لە فۆرمێکی هونەریدا بۆدەردەبڕیو ناسنامەی (شێرکۆ بێکەس)یشمان، وەکو شاعیرێك دەخاتە بەردەست.

بێجگە لەم دوو خسڵەتەی داهێنانی هونەری دەتوانین لە شێوەی دەربڕینی ئەم داهێنانەدا خسڵەتی نا-زانستیانەو نا-لۆجیکیانەشی بدەینێ.[77] دەزانین زانست پەنا بۆ زانینی ئەزموونگەری دەبات و لەوێوە بە ئاکامەکانی دەگات. دەستەواژەی(ئاسن بە گەرما دەشکێ.) ئەزموونگەرییەو بە تاقیکردنەوەش دروستیەکەی دەسەلمێندرێت. لەبەر ئەمە دەستەواژەکە زانستیانەیەو بە بەڵگەش لۆجیکمەندانە ساخ دەکرێتەوە. شێوازی دەربڕینی هونەری بە پێچەوانەی دەربڕینی زانستیانەوە، پشت بە ئەزموون نابەستێو مەرجیش نیە ڕاستیەکە لە دەستەواژەیەکی ئەزموونگەریدا بخاتەڕوو. دوورکەوتنەوە لەم خسڵەتەی دەربڕینی زانستیانە جوانکاری بە بەری داهێنانە هونەریەکەدا دەکات و دەسەڵاتی داهێنانیشی بەهێزتر دەکات. (نالی) لە هونراوەیەکیدا دەڵێت:

قەسەم بەو شەربەتی دیداری پاکت
شەرابم عەینی ژەهری مارە بێ تۆ
لەکن تۆ خارو خەس گوڵزارە بێ من
لەکن من خەرمەنی گوڵ خارە بێ تۆ[78]

[77]- ئەم کێشەیەم لە کۆڕێکدا لە ڕۆژی 2001/10/07 لە شاری سیدنی، کە ناوەندی ڕۆشنبیری کورد لە ئوستراليا بۆیان سازکردم، باسکردووە.

[78]- دیوانی نالی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و فاتح عەبدولکەریم. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1979. لاپەڕە382.

(شەربەتی دیدار)، لەم هۆنراوەیەدا، دەربڕینێکی هونەری شاعیرە بۆ بینینی خۆشەویستەکەی دایهێناوەو نرخێکی هونەری بەرزی بە هۆنراوەکە داوە. لە هەمانکاتدا(شەربەتی دیدار) بەگوێرەی زانینی زانستیانە لە داکەوتدا بوونی ناسەلمێنرێت و وەکو شەربەتی مێوژ لە بازاڕدا نافرۆشرێت. لە لێکۆڵینەوەی زانستیانەو لۆجیکمەندانەدا ئەم پارچە هۆنراوەیە نازانستیانەو ڕێتێنەچوە. لە نموونەیەکی دیکەدا شێرکۆ بێکەس لە (دەربەندی پەپوولە)دا دەڵێت:

ئەی گیانی گیان!
گۆمێ شێت بوو وەختێ لەمانگیان دابڕی
مانگیش شێت بوو وەختێ لەهەوریان دابڕی
هەوریش شێت بوو وەختێ لە شاخیان دابڕی
شاخیش شێت بوو وەختێ لە بەفریان دابڕی
بەفریش شێت بوو وەختێ لە عەردیان دابڕی
عەردیش شێت بوو وەختێ لە خەڵکیان دابڕی[79]

شێوەی دەربڕینی هونەری لەم پارچە هۆنراوەیەدا، وەکو شێوەی دەربڕینی(نالی) ڕەتدانەوەی بیرکردنەوەی زانستیانەو لۆجیکمەندانەیە. کێشەیەك (گۆمێ شێت بوو وەختێ لە مانگیان دابڕی) بەگوێرەی بیرکردنەوەی زانستیانە ناگونجێت و کێشەیەکی بێواتایە. گۆم شێت

[79]- شێرکۆ بێکەس، دەربەندی پەپوولە، ستۆکهۆڵم، 1990. لاپەڕە121.

نابێت و له مانگیش دانابڕێت. شێت بوون تێكچوونی شێوازی بیركردنەوەیەو لەم هۆنراوەیەدا بەگۆم و هەورو شاخ و بەفرو عەرد دراوە، كە ئەم شتانە هەبووی لە ئاگابەدەرن و بیر ناكەنەوە. بەڵام شاعیر توانیویەتی لەم شێوە هونەرییەدا سەركەوتوانە تراجیدیای دابڕین و ئاوارە بوونی (خەڵك)مان لە خاكەكەیەوە بخاتە بەردەم. ئەگەر شاعیر زانسیانە بیری لە كێشەی دابڕینی خەڵك لە خاكەكەیەوە بكردایەتەوە نەیدەتوانی ئەم پارچە هۆنراوەیە بنوسێت. لە نموونەیەكی دیكەدا فەرهاد شاكەلی لە دیوانی (نیگاری تۆ لەدیواری زیندانەكەم هەڵدەكۆڵم)دا دەڵێت:

یادت وەكو گەواڵە هەورێكی سپی
بە ئاسمانی تاریكی دڵما ڕادەبوورێ
ڕەگەكانم، یەك بەیەك،
لە شەپۆلی گوڵاوێ سەرشار دەبن[80]

شێوەی دەربڕین و تابلۆی داهێنراوی هونەری ئەم كۆپلەیەش، وەكو كۆپلەی هۆنراوەكانی پێشو نازانستیانەو لە لۆجیك بەدەرە. بە گوێرەی زانستەكان(پزیشكی)دڵ ئۆرگانێكە لە ناو سینەداو ئاسمانی نیەو شەویشی بەسەردا نایەت و گەواڵە هەوریشی تێدا ڕانابورێت و ڕەگەكانی شاعیریش بێجگە لە خوێن چیدیكەی تێدا سەرشار نابێت. بەڵام لە ڕووی هونەرییەوە ئەم كۆپلەیە سەركەوتووانە یادكردنەوەی خۆشەویستێكی

[80]- فەرهاد شاكەلی، نیگاری تۆ لەدیواری زیندانەكەم هەڵدەكۆڵم، ستۆكهۆڵم، 1994. لاپەڕە 46.

دووركەوتوومان بۆ دەردەبڕێت. ڕەفیق سابیر لە دیوانی (ڕێژنە)دا دەنوسێت:

جێم مەهێڵە

من بەبێ تۆ

کەژێکی بێ کانی و بەفرو دارستانم

من بە بێ تۆ

ئەستێرەیەکی ئاوارەو بێ ئاسمانم[81]

کەژی بێ بەفرو کانیو دارستان هەیە بەڵام ئەستێرەی ئاوارەو بێ ئاسمان لە داکەوتدا نیەو تەنیا لە جیهانی هونەردا ئەم دیاردەیە پەیدا دەبێت. داهێنانی هونەری لەم بۆچوونەمانەوە یاخیبوونە لە بیرکردنەوەی زانستیانەو لۆجیکمەندانە. گەڕانەوەشمان بۆسەر پێناسەکەمان بۆ داهێنان(پەلکێش کردنی بوونێك لە نەبوونەوە) جارێکی دیکە لە بەردەم ئەم پرسیارەدا ڕامانده‌گرێت؛ ئایا چۆن بوونێك لە نەبوونەوە پەیدا دەبێت؟ ئەم کێشەیە لە مێژووی فەلسەفەدا لە سەدەمی ئەریستۆوە مشتومڕی لەسەر کراوە. بۆ ئەریستۆو شوێنکەوتوانی سیستەمە مێتافیزیکیەکەی بوون لە نەبوونەوە پەیدا نابێت. لە بەر ڕۆشنایی ئەم کێشە مێتافیزیکیەشدا ئەریستۆو شوێنکەوتوانی سیستەمەکەی گەیشتونەتە ئەو بڕوایەی خوا جیهانی ئافەرید نەکردبێت و بەڵکو(ئەستو) ماتەری هێناوەو

[81]- ڕەفیق سابیر، ڕێژنە، پەڕتووکخانەی سیدیان، مەهاباد، 1979.لاپەڕە 43

فۆرمی پێداوە. ئەمەش بە پێچەوانەی بۆچوونی ئایینی سامیەکانە، کە باوەڕی بە ئافەرید کردنی جیهان لە(هیچ)ەوە هەیە.[82] ئێمە لێرەدا نامانەوێت بگەڕێینەوە بۆ مشتومڕی نێوان ئەم دوو بۆچوونە جیاوازەو پێناسەکەمان بۆ داهێنان لەبەر ڕۆشنایی ئۆنتۆلۆجیەکەمان داتاشیوە. بەبیروڕای ئێمە ئەگەر داهێنان پەلکێش کردنی بوونێك لە نەبوونەوە نەبێت پێی ناوترێت داهێنان. هەموو بەرهەمێکی هونەری لەم ڕووەوە شتێکی داهێنراوەو هونەرمەندەکەی بڕیاری داهێنانی داوە. تابلۆکەی پیکاسۆ بە ناوی(گۆرنیکا)لە ساڵی 1937تەواو کراوەو لە پێش ئەو کاتە دیاریکراوەدا ئەو بەرهەمە هونەرییە(نەبوو)بووەو ئێستا شتێکە، کە هەیە. ڕاستە پیکاسۆ لە داهێنانی تابلۆیەکی هونەرییدا کانڤاس و ڕەنگ بەکار دەهێنێت، یان نالی بۆ هۆنینەوەی هۆنراوەیەك(زمان)ی لە بەردەستدا بووەو ئەمانە شتێکن هەن. لەبەر ئەمە، لەوانەیە هەندێك وا بیر بکەنەوە داهێنانی هونەری پەلکێش کردنی بوونێك لە نەبوونەوە نیە. بیرکردنەوەیەکی وا، ئەگەر بە ڕەخنەش دابنرێت جێگای تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام هێشتا بناخەی بۆچوونەکەمان ناڕووخێنێ. بەرهەمی هونەری کانڤاس و ڕەنگ و زمان نیە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت

---

[82]- ئەم دوو کێشەیە: باوەڕی ئەریستۆو شوێنکەوتوانیو باوەڕی ئایینە سامیەکان(یەهودیەت، مەسیحایەتیو ئیسلامەتی)گرفتێکی گەورەی بۆ فەیلەسوفە موسوڵمانەکان هێناوەتە گۆڕێ و هانی زۆریانی دا پەنا ببەنە بەر(بیردۆزی دەرچوون)ی ئەفلوتین. بێجگە لە کەندی فەیلەسوفە موسوڵمانەکان لە فارابییەوە بۆ ئیبن ڕوشد و لە دواییشدا سوهرەوەردیو ئیبن عەرەبیو مەلاسەدرا نەیانتوانیوە بە تەنیا لایەنی باوەڕی ئایینی بگرن و بە تەواوی واز لە ئەریستۆ بهێنن.

بەرهەمێکی هونەری پێویستی بەم شتانە نەبێت. بەبێ کانڤاس و ڕەنگ گۆرنیکا و بەبێ زمان هۆنراوەکانی نالی نابن. لە هەمانکاتیشدا ناتوانین بڵێین هەرکەسێك کانڤاس و ڕەنگی هەبێت(گۆرنیکا) دادەهێنێ یان هەموو وشەکانی ناو (هەنبانە بۆرینە)ی هەژاری لەبەربێت دیوانەکەی (نالی)یشی خوێندۆتەوە چونکە(نالی) هەر وشەیەکی بەکار هێنابێت لە ناو (هەنبانە بۆرینە)دا هەیە.

داهێنانی هونەری بە تەنیا یەکگرتنی شێوەو ناوەڕۆك نیە. ئەو یەکگرتنە دەوری لەوێدایە، کە داهێنانەکە دەکات بەشتێك.[83] لەم ڕووەوە هەموو بەرهەمێکی هونەری(شت)ە بەڵام هەموو شتێك بەرهەمی هونەری نیە. جووتێك پۆستاڵ شتەو بە بەرهەمی هونەری دانانرێت، کەچی تابلۆی پۆستاڵەکانی ڕوشدی ئەنوەر بەرهەمێکی هونەرییەو ئەم هونەرمەندە دەیەوێت لەوێدا ڕاستیەکی لەوەو پێش نەناسراو بخاتەڕوو. پێویستە لە خۆمان بپرسین سەرچاوەی داهێنانی هونەری چیە؟ لە بەر ڕۆشنایی سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەمان سەرچاوەی داهێنانی هونەری بوونی مرۆڤەو ناگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتێکی بێگانەو دەسەڵاتێکی پێدراو. ئەوەی مرۆڤ دەکات بە هونەرمەند بەرهەمە هونەرییەکەیەتی.

[83]- Martin Heidegger. "The Origin of the Work of Art", *Basic Writings*, David Farrell Krell(ed.), London: Routledge, 1978. P. 147

باسمانکرد داهێنان پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤەو مرۆڤ بە ئەندێشە بەرهەمەکەی دادەهێنێت. ئەندێشە جۆرێکە لە ئاگامەندیو سەرچاوەی داهێنانی هونەرییە. لەم ڕووەوە بابەتی ئەندێشە بابەتی ئاگامەندییە، بەڵام هەموو بابەتێکی ئاگامەندی لە ناو (ئەندێشە)دا پەیدا نەبووە. مێزەکەی بەردەمم بابەتی ئاگامەندییەو ئێستا من هەستی پێدەکەم. دەزانم شتێکە لەناو قاوەخانەکەدا لە دەرەوەی بیرکردنەوەی مندا دانراوەو خۆی بۆ من دەرخستوە. هەبوون و نەبوونی مێزەکە نەبەستراوە بە ئاگامەندی منەوە. من هەبم یان نا گەردێك لە هەبوونی مێزەکەکەمو زیاد ناکات. هەبوونی مێزەکە، وەکو بابەتێکی دەرەکی(لەدەرەوەی ئاگامەندی)بە بوونی منەوە گرێنەدراوە. ئەگەر من ڕۆژێك نەڕۆم بۆ قاوەخانەکە کەسێکی دیکە هەیە هەستی پێبکات و بەکاری بهێنێت. من گومان لە بوونی دەرەکی مێزەکە بە بێ ئاگامەندی خۆم ناکەم. بابەتی ئەندێشەش، بە پێچەوانەی مێزەکەوە، شتێك نیە لە دەرەوەی ئاگامەندیدا خۆی دەرخستبێت و لە داکەوتدا بێت. ئێستا من بیر لە هاوڕێیەکی خۆشەویستم دەکەمەوە، کە لەمنەوە دوورە و دەمێکە نەمدیوە. بە ئەندێشە هاوڕێکەم یان ئەو بابەتە بۆ خۆم دادەهێنم. هاورێکەم، وەکو کەسێك یان بابەتێکی دەرەکی لە داکەوتدا هەیە. لەوانەیە ئێستا ئەویش بیر لەمن بکاتەوە، پەڕتووکێك بخوێنێتەوە یان پرۆژەیەکی نوێ بۆ ژیانی ڕەنگ ڕێژ بکات. من نازانم ئەو چی دەکات، چۆنە یان لە چ بارودۆخێکدایە.

ئەو چۆن بێت و چی بکات لەو فۆرمەوە دوورە، کە ئەندێشەو ڕامانی من لە بارەی ئەوەوە پەیدایکردووە.

جیاوازی نێوان ئاگامەندی و ئەندێشە بە بونیادی ئۆنتۆلۆجییانەوە نەبەستراوە. چونکە دوو شتی جیاواز نین و ئەندێشەش ئاگامەندییە. جیاوازی نێوانیان لە چۆنیەتی دەستەڵات و مامەڵەکردنیان لەگەڵ بابەتەکەیاندا سەر هەڵدەدات. ئەندێشە کەڵك لە داکەوت وەردەگرێت بەڵام سەربەستانە بابەتەکەی خۆی دادەهێنێت و دەسەڵاتێکی ڕەها(بێسنور)ی بە سەرەوە هەیەو دەتوانێت هەر کاتێك بیەوێت ئەو بابەتە هەڵوەشێنێتەوەو دایهێنێتەوە. دەسەڵاتی ڕەتدانەوەی ئاگامەندی لە ئەندێشەدا دەگاتە ترۆپکی خۆدەرخستن و سنوور بڕین. بەرهەمی هونەری هەرچ شێوازێك وەرگرێ هەڵقوڵاوی ئەم دەسەڵاتە بێسنورەیە، کە بێجگە لە مرۆڤ چی دیکە نیەتی."شەربەتی دیدار"و"گۆمی شێت بوو"و"ئاسمانی تاریکی دڵ"و"ئەستێرەی ئاوارەو بێ ئاسمان" لە داکەوتدا نین و دەسەڵاتی بێسنوری ئەندێشە دایهێناون.

دەسەڵاتی ڕەتدانەوەی ئەندێشە بە دوو جۆر خۆی دەردەخا: یەکەم ڕەتدانەوەی داکەوتێکی نەویست و دووهەم داهێنانی داکەوتێکی ویستراو لە نەبوونەوە. ئەندێشە لە کاتێکدا ڕەتی داکەوتێکی نەویست دەداتەوە، کە

بتوانێت داکەوتێکی ویستراو دابهێنێت. ڕەتدانەوە بڕیاردانە. لەنێو واتای هەموو(نا)یەکدا (بەڵێ) هەیە. ئەندێشە خولیای بابەتێکی دابڕاو یان نەبووی ویستراوە. نەبوونی یان دابڕان هەستکردن بە نوستەڵجیا پەیدا دەکات.[84] (نۆستەڵجیا) بەگوێرەی واتاکەی لە فەرهەنگەکانی زماندا خەمی دوورە وڵاتی دەبەخشێت. من لێرەدا بەشێوەیەکی فراوانتر بەکارم هێناوە. وڵات بە هێمایەك دادەنێم مرۆڤ لێوەی دوورەو لێی دابڕاوە. نۆستەڵجیا بۆ من دەبێتە خەم و پەژارە بۆ ئەو بوونەی هێشتا پەیدا نەکراوەو مرۆڤی لێی دابڕاوە. ئەم هەستکردنە لە هەر شێوازێکدا خۆی دەربخات نۆستەڵجیایە بۆ بوون. نۆستەلجیای ئەفلاتون و هیگڵ و هایدیگەرو غەزالیو نالی و ئیسماعیل خەیات بۆ بابەتی هەندەکی جۆراوجۆرن بەڵام هەموو ئەو بابەتانە، کە سنوری هەندەکی خۆیان دەبڕن دەبن بە بوون و نۆستەڵجیاش دەبێت بە هەستکردن بە دابڕانی بوون لە بوونی مرۆڤەوە. ئەوەی غەزالی گەیاندە شێت بوون یان بووە هۆکار بۆ گریان و ناڵەی شاعیرێکی وەکو نالی نۆستەڵجیا بوو.[85] حەزدەکەم لێرەدا

---

[84]- نوستەڵجیا زاراوەیەکی یۆنانیە لەNostos واتە گەڕانەوە بۆ وڵات و Aglos ئازار پێکهاتووە. واتای زاراوەکە خەم و ئازاری دوورە وڵاتیە. بڕوانە:

A. F. Scott. *Current Literary Terms*, London: The Macmillan Press, 1979. P. 196

[85]- ئەبوو حامد ئەلغەزالی (1058- 1111)زانایەکی سەر بە فێرگەی کەلامی ئەشعەرییەکان و سۆفیەکی گەورەی موسوڵمان بووە. لە سەدەمی سەڵجوقیەکاندا لە بەغدا مامۆستایەتی کردووە. باری دەروونی تووشی حاڵەتێکی نەخۆشی کردوو لە زمانیش کەوت. بەو نەخۆشیە ڕووی کردە دمشەق و لە مزگەوتێکی ئەمەوییەکاندا دوو ساڵ لە ناو منارەکەیدا مایەوەو لەوێوە چوە قودس و مەککە. پاش دەساڵ چاك بووەوەو ڕووی کردەوە خۆراسان و لە شارەکەی خۆی(توس) بوو بە

ئەوە بڵێم، کە هایدیگەر یەکەم بیریارە ئاماژەی بە گرنگی دابڕانی (بوون) لە بیرکردنەوە کردبێت.[86] بەڵام ئەو زاراوەی نۆستەلْجیای بەکار نەهێناوە. بە بیروڕای هایدیگەر، زانایانی پاش ئەریستۆ خۆیان بە هەبووە هەندەکیەکانەوە ماندوو کردووەو (بوون) یان لەبیرچووە یان ئەم(ڕاستیە)یەیان لە ئاگامەندی دابڕیوە. ئەمەش بۆتە هۆکاری سەرهەڵدانی نامۆیی لە بیرکردنەوەی فەلسەفیانەی ڕۆژ ئاوادا، کە بە نیهێلیزم ناوزەدی دەکات.

لەم توێژینەوەیەوە، دیسانەوە دەگەڕێینەوە سەر کێشەی بونیادی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی مرۆڤ. بوونی مرۆڤ ناتەواوەو کەلەبەرێکی گەورەی (نەبوون)ی تێدایە. بوونێکە، بە پێچەوانەی هەبووەکانەوە، بێ ناوەڕۆك. ئەم ناتەواوییە دابڕانیەتێتی لە تەواوکۆیی. ئەمەش توێژینەوەکەمان دەگەیەنێتە ئەو باوەڕەی، کە(داهێنان) بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ ئەم بوونە دادەنێت. بە هەمان شێوەش، مادامەکی ئەم دابڕانە لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤدایەو مرۆڤ لە بنەڕەتدا ناتەواوەو لە تەواوکۆیی بێ بەشکراوە هەستکردن بە(نۆستەلْجیا) دەبێت بە پێشمەرجێکی دیکە بۆ بوونی. ئەگەر ئەم بوونە پڕو تەواوکۆ بوایە

---

مامۆستا. غەزالی پەڕتووکی زۆری نوسیوە و یەکێك لەوانە ڕەخنەو هێرشەکانی بوو بەناوی(تهافت الفلاسفة) بۆ سەر ئەلفارابیو ئیبن سینا.

[86] - Martin Heidegger. *Being and Time.* P.2

ناوەڕۆکێکی پێشوەختی بەسەردا بسەپێنرایە نەیدەتوانی لافی داهێنەری لێبدات و هەستکردن بە نۆستەڵجیاش لە ناخیدا سەریهەڵنەدەدا. دابڕان لەم ڕووەوە یان بەم شێوەیەی ئێمە باسیدەکەین بەتەنیا ڕووداوێکی مێژوویی نیە بەڵکو بەستراوە بە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤەوە.

نۆستەڵجیا بایەخی ئۆنتۆلۆجیو مێژوویی خۆی هەیە. لەلایەکەوە ئەو واتایە دەدات مرۆڤ بە نەبوونی پەیدا بووەو لە زۆر شت دابڕاوە یان(مەحروم- بێبەش)بووە. لە لایەکی دیکەوە ئەم بە ئاگاهاتنەوەیە دەبێتە هاندەر بۆ ئەنجامدانی پڕۆژەی خۆ تەواوکردن. لە ژێر دوو بارودۆخی نەرێدا هەستکردن بە نۆستەڵجیا کپ دەکرێت و ڕۆڵی گرنگی خۆی وون دەکات: یەکەم لەو حاڵەتەدا، تاکێك درۆ لەگەڵ خۆیدا دەکات و خۆی لە لێپرسینەوەو سەربەستیەکەی دوور دەخاتەوە. دووەمیش لەژێر بارودۆخی ژیانی نامۆبووندا. لەم هەردوو بارودۆخە نەرێییەدا چۆنیەتی بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤ ڕەتدراوەتەوەو مرۆڤ بە نا-مرۆڤ کراوە. درۆ لەگەڵ خۆ کردن و بە نامۆ بوون، هەرچەندە هەردووکیان یەك ئاکامی فەلسەفیان هەیە ئەویش بە نا-مرۆڤ کردنی مرۆڤە، لە میتۆدی گەیشتن بەو ئاکامە جیاوازن. درۆ لەگەڵ خۆ کردن سەر بە هۆکارێکی ناوەکیو نامۆیش هۆکاری دەرەکی هەیە. تاکێك دەیەوێت تاکێکی دیکە بڕیار لەسەر پڕۆژەیەکی ژیانی بدات و بۆی هەڵبژێرێت. ئەم تاکە بەم

کارەی نکۆڵی لە دەسەڵاتی داهێنان و سەربەستی خۆی دەکات و لە لێپرسینەوەی بەرامبەر ئەنجامی کارەکەی ڕادەکات. لەم هەڵوێستەدا ئەو تاکە درۆ لەگەڵ بوونی خۆی، وەکو بوونێکی داهێنەرو سەربەست دەکات. لە نامۆییدا دەسەڵاتێکی دەرەکی بە(زۆر)بڕیار لەسەر هەڵبژاردن و بە ئەنجامدانی پرۆژەیەك بەسەر تاکدا دەدات و بە بێ ئەوەی ئەو تاکە پرسی پێبکرێت و ڕێگەی بدرێت ئەو پرۆژەیە سەربەستانە هەڵبژێرێت.

بۆ ئەوەی جارێکی دیکە خۆمان لە بیروباوەڕی هیگڵ دوور بخەینەوەو نەکەوینە ژێر کارتێکردنی توێژینەوەکەی لەمەڕ ئاگامەندیو دەرچوونی بابەتی بیرکردنەوەی، حەزدەکەم جەخت لەسەر ئەو خاڵە بکەم، هەستکردن بە نۆستەڵجیا لە گۆشەنیگای ئۆنتۆلۆجیەوەو بەو شێوەیەی ئێمە باسمانکردووە، هەستکردن بە نامۆیی نیە. لە فەلسەفەی هیگڵدا ئاگامەندی بوونێکی پڕو تەواوی هەیەو خۆی بابەتەکە لە خۆی جیادەکاتەوەو ئەو نامۆییە بەسەر خۆی و بابەتەکەشدا دەسەپێنێت. ئەنجا ئاگامەندی هەوڵدەدات جارێکی دیکە بابەتە دابڕاوەکە بگەڕێنێتەوە بۆ خۆیو خۆی ببێتە خاوەنی. بۆ هیگڵ، ئاگامەندی ڕێگەنادات بێجگە لە خۆی بوونێکی دیکەو(جیاواز)هەبێت. ئەو بوونەی بە جیاوازیش، پێش یەکگرتنەوەی لە گەڵ ئاگامەندیدا، دادەنرێت لای هیگڵ فۆرمێکی ئاگامەندییەو شتێکی هەرە جیاواز نیە، تاکو ئاگامەندی

نەتوانێت بیخاتە سەر بوونی خۆی. لە لۆجیکی دیالێکتیکی هیگڵدا باسی جیاوازی کراوەو بە گوێرەی ئەو سیستەمی شتەکان لە زۆر ڕووەوە جیاوازن لە ڕووی دیکەوە یەکن، بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنجی سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەکەی بدەین هەوڵی لە ناوبردنی جیاوازییەکان دەدات و بوون بە یەك جۆر ڕاستیو ڕاستەقینەوە گرێدەدات. یەك جۆر ڕاستی، کە بێجگە لەو چیدیکە بە ڕاست دانانرێت و چیدیکەش لە دەرەوەی ئەودا نیەو دەسەڵاتێکی بێسنوری بەسەر هەموو لایەنەکانی بووندا هەیە ناوەڕۆکی بیروباوەڕی هیگڵی داگیرکردوە.

کاتێك ئێمە باسی ئاگامەندی دەکەین، مەبەستمان ئاگامەندی ڕەها *Geist*ی هیگڵ نیەو ئاگامەندی تاکە کەسەکانە. هەروەها ناڵێین ئاگامەندی خۆی توشی نۆستەڵجیا کردووە. نۆستەڵجیا لە بوونی ئاگامەندییدایە چونکە لە بنەڕەتەوە لە تەواوکۆیی دابڕاوەو بە نەبوونیەوە پەیدا بووە. لە سەرو ئەمانەشەوە(جیاوازی) بە کێشەیەکی سەرەکی لە توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەماندا دادەنێین و بڕوامان بە لابردن و فەوتانی نیە. ئەوەی بوونی مرۆڤێك تایبەتمەند دەکات(جیاوازی) ئەم بوونەیە لە بوون و هەبووەکانی دیکەوەو جیاوازی نێوان تاکەکانی کۆمەڵە.

تویژینەوەکەمان زیاتر لە بیروباوەڕی (فیورباخ)ەوە نزیکە. بۆ فیورباخ بیروباوەڕی ئاینی نامۆ بوونی مرۆڤە لە دەسەڵاتێکی بێسنورو تەواوکۆیی. دەسەڵاتی سنورداری مرۆڤ ڕێگە نادات لافی بێسنووری و تەواوکۆیی لێبدات و ناچاری دەکات ئەو دەسەڵاتە بکات بە باری بوونێکی دیکەو لە خۆی دادەبڕێ. لە بیروباوەڕی ئایینیدا مرۆڤ هەست بە نەبوونی ئەو دەسەڵاتە لە ناو بوونی خۆیدا دەکات و پەنا بۆ بوونێکی دیکە، کە لە خۆی بەرزترە دەبات و نۆستەڵجیا بە زەقی لە ناویدا دەردەخات.

نۆستەڵجیای ئایینی، هەرچەندە بنەڕەتێکی مێتافیزیکی هەیە، لە شێوازی نۆستەڵجیای باسەکەمانەوە جیاوازە. بێگومان هەردوو ئەم شێوازانە لە چۆنیەتی بابەتەکەیاندا (تەواوکۆیی) یەك دەگرنەوە، بەڵام لە بنەڕەت و میتۆدا لەیەکدی دوور دەکەونەوە. ئایین هەوڵدەدات ڕێگە چارەیەك بە ئومێدی ژیانی بەردەوامەوە پاش مردن بە مرۆڤ نیشان بدات و شوێنکەوتووەکانی ئایینیش ڕێگەیان پێنەدراوە گومان لە دروستیو نادروستی ڕێگە چارەکە بکەن. بۆ ئێمە نۆستەڵجیا لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤدایەو لە ئاگامەندی ناپچڕێت. لە نۆستەڵجیاوە، مرۆڤ بە بەردەوامی هەوڵی گەیشتن بە تەواو کۆیی دەدات. لە بەر

ئەوەی بوونی (کات)یەو دەبێ بمرێت هەوڵدانەکەی بێکەڵکە و تراجیدیایە.

بەشی چوارەم

# مردن

تاکو ئێرە توێژینەوەکەمان خۆی بە(بوون)ەوە ماندوو کردوەو باسی نەکردووە بۆچی مرۆڤ ناتوانێت بە تەواوکۆیی بگات. کێشەی گەیشتن بە تەواوکۆیی لە هەڵوێستێکی نیهێلێستیانەوە دەمانخاتە بەر ڕەخنەی ئەوانەی خۆیان بە ڕووناکبین دادەنێن و باوەڕ بە کۆتاییەکی باشتر بۆ مرۆڤ دەهێنن. ئێمە لە خۆڕا لە توێژینەوەکەماندا بەم ئاکامە نەرێیە نەگەیشتوین و هۆکارو بناخەی لۆجیکمەندانەی هەیەو بەستراوە بە بونیادی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونەوە. مادامەکی بوونی مرۆڤ لە بنەڕەتدا لە واتا بەدەرو بێ مەبەستەو ناوەڕۆکی لە پێشتری پێنەدراوە ئەوا خۆ-تەواوکردن یان ڕەوتی بوونی بەرەو تەواوکۆیی پێویستیەکی ئۆنتۆلۆجیە. بەڵام نابێ ئەو خاڵە سەرەکیە لە بیر بکەین، کە مرۆڤ بوونێکی (کاتی )ی هەیەو بڕاوەیەو کۆتایی دێت. بوون و مردن تەواوکەری یەکدین و لەبەر ئەوەی هەیە دەبێ بمرێت یان ئەو دەمرێت چونکە هەیە. (کات)یەتی بوونی سەرەتاو کۆتایی لە بوونیدا پەیدا دەکات و شێوازێکی

مێژوویی بە بەریدا دەکات. لە تێگەیشتنی ئەم ڕاستیەی بووندا مرۆڤ هەوڵدەدات خۆی بەدوا پلەی گەشەکردن و خۆ- تەواوکردن بگەیەنێت.

لەم بۆچوونەمانەوە (مردن) ڕووداوێك یان گونجاو نیەو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوون. ئەمەش بە پێچەوانەی بۆچوون و توێژینەوەکەی هایدیگەرە، کە مردن بە(گونجاو) Possibility لە قەڵەم دەدات:

"مردن گونجاوی بوونی مرۆڤە. [دەزانین] لە مردندا، مرۆڤ بەرامبەر خۆی بە پڕی و هەموو توانایەوە ڕادەوەستێت. ئەم گونجاوییەی بوونی مرۆڤ بەستراوە بە بوون- لەناو-جیهاندا. مردن گونجاندنی نەبوونی ئەم بوونەیە لێرەدا."[87]

مردن کۆتایی بوون و پڕۆژەکانی بوونە. کۆتایی بوونیش کوژانەوەی ئاگرو وەستانی باران بارین نیە. ئاگرو باران جارێکی دیکە سەر هەڵدەدەنەوە ، بەڵام، کە کۆتایی بە بوون دێت، ئەو بوونە جارێکی دیکە لەو نەبوونەوە ناگەڕێتەوە بۆ بوون. ئەو ڕێچکە فەلسەفیانەو ئایینیانە، کە باوەڕیان بە بەردەوامی بوون پاش مردن هەیە، لە بەکارهێنانی چەمکی(مردن)دا تووشی پارادۆکسی بوون. ئەوان بوونی مرۆڤ بە ناوەڕۆکێکی گیانەکیەوە دەبەستنەوەو ناوەڕۆکەکەش لە دەرەوەی خولەی گۆڕانکارییەکانی ناو کات و شوێندا ڕادەگرن. لەو باوەڕەدان جەستەو

---

[87]- هەمان سەرچاوە. لاپەڕە 294

تێکچونی جەستە کارتێکردنی خۆیان بەسەر ناوەڕۆکی گیانەکیەوە تۆمار ناکەن و دووەمیان وەکو خۆی دەمێنێتەوەو بوونی بەردەوام دەبێت. بۆ نموونە لە پەڕتووکی ئایینی هێندییەکاندا(باگڤێت گیتا) بەم شێوەیە پێناسی ناوەڕۆکی گیانەکیو پەیوەندی لەگەڵ جەستەدا کراوە:

"بۆگیان لە دایك بوون و مردن نیە،

گیان نە هاتۆتە جیهانەوەو نایەتەناو جیهانیشەوە.

هەمیشە بووەو بوونی بەردەوامە.

تێکچونی جەستە گۆڕان بەسەر ئەودا ناهێنێت"[88]

لە مێژووی فەلسەفەشدا، بیروباوەڕی فەیلەسوفە ئایدیالیستەکان لە بۆچوونی ئایینییەوە نزیکە. سوکرات(470-399 پێش زایین) لە دوا ڕۆژی ژیانیا لە ناو زیندانی ئەسینا بە بێترس ژەهرەکەی نۆشیو مردنی بە دەرچوون بۆ جیهانێکی باشترو بەرزتر دانا.[89] لەم ڕێچکەیە دوانەکیەوە (گیان و جەستە)سوکرات و ئەوانەی پەیرەوی ئەم ڕێچکەیە دەکەن باوەڕیان بە دووجۆر داکەوت لەبوونی مرۆڤدا هەیە: داکەوتی ئەستوویی و گیانەکی(یان لە ئەستو بەدەر). ئەم ڕێچکەیە کارتێکردنی خۆی بەسەر بیروباوەڕی فەلسەفی سەدەکانی پاش سوکراتەوە بەجێهێشتوە.

---

Bahagavat Gita. 2:20 -[88]

(بەگڤیت گیتا واتە(سرودی یەزدانی) یەکێکە لە ئۆپانیشادەکان و بە گرینگترین و پیرۆزترین پەڕتووکی ئایینی دادەنرێت. لەم پەڕتووکەدا یەزدان (کریشنا) گفتوگۆ لەگەڵ(ئەرجون)ئەمیرو یۆگیدا دەکات و فێری زانینی بەرزی یۆگای دەکات.

Plato. “Phaedo”, *The Last Days of Socrates*, Betty Radice (ed.), London: -[89]
Penguin Books, 1985. PP. 180-81

لەسەدەمی ئەفلاتونەوە بۆ هێلێنیزم و سەدەکانی ناوەڕاست و سەدەمی نوێی دێکارت و کانت زۆر لە فەیلەسوفەکان(بێجگە لەوانەی پەیڕەوی ڕێچکەی یەکانەکی بوون و ماتڕیالیزمیان کردوە) شوێنکەوتووی ڕێچکەی دووانەکی بوون.

لە پێشتر ئاماژەی بۆکرا، بەکارهێنانی چەمکی مردن لە بۆچوونێکی ئایدیالیستیانەو ئایینی‌یەوە پارادۆکسە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی واتای چەمکی مردن لای ئایدیالیستەکان و خاوەن باوەڕی ئایینی. ئەگەر (مردن) جەستە گۆڕین یان دەرچوونی گیان بەرەو جیهانێکی بەرزتر بێت، ئەوا بەمردن دانانرێت. مردن لە بۆچوونێکی نیهێلیستیانەوە، وەکو بۆ چوونەکەی ئێمە، واتای تەواوی خۆی دەبەخشێت. ئایدیالیستەکان و شوێنکەوتوانی باوەڕی ئایینی بۆیان نەهاتوە باسی مردن بکەن.

هەڵوێستی سوکرات لە ئاستی مردنەکەیدا ڕاستگۆیی ئەم فەیلەسوفە لەگەڵ بۆچوونە دوانەکیەکەیدا دەردەبڕێت. مردن بۆ سوکرات کۆتایی بوون نیەو گۆڕانکارییە یان سەرەتای قۆناخێکی دیکەیە. هەروەها بە بیروڕای سوکرات ئەگەر مرۆڤ بتوانێت لەم ژیانەدا بە ڕێگەی زانین و بیرکردنەوەی فەلسەفیانە گیانی خۆی لە گوناحەکان بپارێزێت دوای

مردن ژیانێکی باشتری پێدەدرێت.[90] بیروباوەڕی زاڵبوی ڕێچکەی دووانەکی بەسەر فەلسەفەی ڕۆژئاوادا لە هەمانکاتدا ڕەتدانەوەی واتای مردن دەسەپێنێت. دەبوایە شوێنکەوتوانی ئەم ڕێچکەیە زاراوەیەکی دیکەیان بۆ مردن بدۆزیبایەتەوە. لەم ڕەتدانەیەشەوە هەڵوێستی سوکرات لە ئاستی مردنەکەی خۆیدا بە ئازایەتی دانانرێت. کەسێك باوەڕی بە مردن نەبێت یان مردن بە دەرچوونی گیان بەرەو جیهانێکی بەرز لێکبداتەوە لە ڕووداوی گیان دەرچوونەکە ناترسێت. لەوێدا سوکرات بە ئازا دادەنرێت، کە نیهێلێستیانە بیر لە مردن بکاتەوەو ڕووبەڕووی بوەستێت. نموونەیەکی دیکەی، وەکو هەڵوێستی سوکرات لە مردنەکەی حەلاجی کوڕی مەنسوردا دەبینرێت. بە گوێرەی ڕوایەتەکان خواستی مردنی کردووەو حەزیکردووە بیکوژن چونکە لە ژیاندا مردن و لە مردندا ژیانی بینیوە. سوکرات و حەلاج واتای مردن بە گیان دەرچوون دادەنێن بۆیە هەردووکیان بەبێ‌ترس مردن هەڵدەبژێرن یان کاتێك حەلاج پارچە پارچەکرا ئاخێکی هەڵنەکێشا.[91] مردن پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە نەك

---

[90]- بۆ سوکرات خوێندنەوەی فەلسەفەو بیرکردنەوەی فەلسەفیانە گیان دەشۆرنەوەو لە گوناحەکان دووری دەخەنەوە. ئەم بیرۆکەیەی سوکرات کاریکردۆتە سەر ئەفلاتون و ئەبوبەکر ئەلڕازی و ئەلفارابی. بۆ ئەم فەیلەسوفانە خوێندنی فەلسەفە خۆ ئامادەکردنی گیانە لە سەفەرەکەیدا بەرەو جیهانی بەرز.

[91]- حەلاج، کوڕی مەنسور(857-922) سۆفیەکی گەورەی موسڵمان لە(تور)نزیك شاری شیراز لە ئێران لە دایك بووە. لە شاری بەسرە ژیاوەو لە ژێر دەستی عەمر کوڕی عوسمان ئەلمەکی تەسەوفی خوێندووە. بە وڵاتانی هێندو تورکستان و فەلەستین و حیجازدا گەڕاوەو لە دواییدا لە بەغدا جێنشین بووە. لە شاری بەغدا مەلاکان لەگەڵیدا ناڕێك بوون و ئەبو داود(مەلایەکی سەر بە فێرگەی زاهیری) فەتوای کوشتنی داوە. بۆ ماوەی هەشت ساڵ دەخرێتە زیندانەوەو دوایی جارێکی دیکە مەلاکان داوا لە ئەلموقتەدر خەلیفەێ عەباسی دەکەن حەلاج بکوژێت. خەلیفەش فەرمانی کوشتنی دەردەکات. حەلاج

ڕووداوێکی گونجاو، چونکە مردن(پڕۆژە) نیە تاکو گونجاو بێت. من دەتوانم بڕیار لەسەر سەفەر بدەم و دواییش بڕیارەکەم بگۆڕم و سەفەر نەکەم. بەڵام ئەم هەڵوێستە لە ئاستی مردندا مەحاڵە. من بمەوێ و نەمەوێ دەبێ بمرم. کاتێك دوکتۆرەکان بەدەرمان چارەی نەخۆشیەکم دەکەن و چەند ڕۆژێکی دیکە دەخەنە سەر تەمەنم تۆزقاڵێك لە کێشەی بوونم بەرەو مردن ناگۆڕن و دەسەڵاتی گۆڕانی مردنیان نیە. نکۆڵی کردن لە پڕۆژەی بوونی مردن ئەوەش ناگرێتەوە، کە من ناتوانم مردن هەڵبژێرم. من دەتوانم مردن بکەم بە پڕۆژەو لە پێش وەختا بانگی بکەم. هێشتا هەڵبژاردنی مردن بڕیاردان لەسەر سەفەرکردن نیە. ئەگەر من ئارەزوی سەفەرکردنم نەبێت، ڕوونادات. ئەمەش بە بێچەوانەی ئارەزو نەکردنمە لە مردن. من نامەوێ بمرم، بەڵام دەسەڵاتی ڕەتدانەوەی مردنم نیە. بە پڕۆژەکردنی مردنیش، (بۆ نموونەخۆکوشتن) خسڵەتی تەواوی پڕۆژە دانانی پێنادرێت. لە بەشی سێیەمی نوسراوەکەماندا باسمانکرد پڕۆژە داهێنانی بوونێکە لە نەبوونەوەو مرۆڤ خۆی بە ئەنجامی

---

لە زیندانەوە بەرەو گۆڕەپانێکی بەغدا پەلکێش دەکرێت و حامید کوڕی عەباس، وەزیری خەلیفە فەرمانی کوشتنەکەی دەخوێنێتەوەو مەلاکانیش، کە لە گۆڕەپانەکەدا کۆبوونەتەوە هاوار دەکەن(بیکوژن دوژمنی ئیسلامە.) ئەبو حارس، جەللادی خەلیفە دێتە پێشەوەو مشتێك بە لوتی حەلاجدا دەداو حەلاج خوێن بەسەر سمێڵ و ڕیشی سپیدا دەڕژێ. ئەبوبەکر شبلی(هاورێی حەلاج) دەگری و یەخەێ خۆی دەدڕێ و چەند شاگردێکی حەلاج بێهۆش دەکەون. لە لایەکی دیکەوە خەڵك هاوار دەکەن حەلاج نەکوژن، پۆلیس خەڵکەکە دوور دەخەنەوە. حەلاج دەخەنە سەر تەختەیەکی پان و بە مێخ بە تەختەکەدا دایدەکوتن. ئەنجا هەردوو دەستیو هەردوو قاچی دەبڕن. شەوێك بەدەست و قاچ بڕاوی بەسەر تەختەکەوە دەمێنێتەوەو ڕۆژی دووەم سەری دەبڕن و لاشەکەی دەسوتێنن.(بڕوانە: الطبری، تاریخ الامم و الملوك، الجز الخامس، دارالکتب، بیروت، 1975. لاپەڕە 677)

دەگەیەنێت. هەڵبژاردن و ڕەتدانەوەی پڕۆژەکە لە دەسەڵاتی مرۆڤدایە. لە بەر ئەم هۆکارە پڕۆژە دەبێت بە بوونێکی گونجاوو مەحاڵ نیە. من سەربەستانە بڕیار لەسەر چوونە سەفەرو هەڵوەشاندنەوەی بڕیار دانەکەشم دەدەم. بەڵام مردن، ئەگەر بە پڕۆژەش بکرێت و نیازی خۆکوشتنم هەبێت، هێشتا پڕۆژەیەکی ناتەواوو یەك لایەنەیە. هەڵبژاردنی مردن گونجاوەو هەڵنەبژاردنی نەگونجاوە. هایدیگەر جارێکی دیکە بە پێچەوانەی بیروڕاکەی ئێمەوە جەخت لەسەر گونجاوی مردن دەکات و دەڵێت:

> "مردن گونجاندنی نەگونجاندنێکی ڕەهایە بۆ مرۆڤ. لەبەر ئەمە، مردن، وەکو دوا گونجاو خۆی دەردەخات، کە ژوور پەیوەندییەکان دەکەوێت."[92]

لێرەدا هایدیگەر مردن بە گونجاندنی نەگونجاندنێکی ڕەهاو دوا گونجاو پێناسە دەکات. ئایا مەبەستی هایدیگەر لە واتای ئەم چەمکانە چیە؟ ئایا هەموو گونجاوێك بە پڕۆژە دانانرێت؟ ئەگەر (گونجاو) پڕۆژە دانان بێت، چۆن مردن دەبێت بە پڕۆژە؟ بە بیروڕای ئێمە ئەگەر مردن دوا گونجاویش بێت مرۆڤ ناتوانێت سەربەستانە ئەو پڕۆژەیە، وەکو سەفەر نەکردن، ڕەتبداتەوە. مردن بە خۆکوشتن، کە بارودۆخێکی تایبەت و

---

Martin Heidegger. Op. cit., P. 294 -[92]

فینۆمینایەکی (شاز)ە دەبێت بە پڕۆژەیەکی هەڵبژێراو. لە بارودۆخی ئاسایی و گشتیدا مردن پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی‌یەو بە گونجاو دانانرێت.

دانانی مردن، بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بەلای شێوازی زانینی و ناسینی مردندا ڕاماندەکێشیٚو لەسەر زەمینەی ئەپستمۆلۆجی ڕاماندەگرێت. چۆن لەبارەی مردنەوە بزانین؟ زانین لە بارەی مردنەوە دوو شێوازە: یەکەمیان لەگومان بەدەرەو شتێکی ناسراوە، دووەمیان نەناسراو یان نەزانراوە. من دەزانم دەبیٚ بمرم. ئەم شێوازی زانینە لە گومانبەدەرەو، وەکو زانین لە بارەی سەفەرکردنمەوە نیە. لەوانەیە لە سەفەرەکەم پەشیمان ببمەوەو نەڕۆم یان ڕێگرێك سەرهەڵبدات و نەتوانم سەفەر بکەم، بەڵام هەر دەبیٚ بمرم. لە لایەکی دیکەوە، لە شێوازی دووەمی زانین لە بارەی ئەم پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەوە، من هیچ نازانم، چونکە مردن بۆ من هێشتا ڕووی نەداوەو تووشی نەبووم. کاتێك ڕوودەدات و دەمرم، من نابم تاکو لە واتاکەی بکۆڵمەوەو ئەزموونی مردنەکەم بخەمە بەر ڕۆشنایی زانین. تەماشاکردنی مردنی کەسانی دیکەش زانیاریمان پێنابەخشێت. ئێمە لە دەرەوەی ئەو ئەزموونەوەو دوور وەستاوی لەکەسانی دیکەوە دەڕوانینە مردنەکەیو ناتوانین لە ناوەوەی ئەزموونەکەوە لە گەڵ کەسانی دیکەدا هاوهەست بین. کەسانی دیکەش تاکو نەمرن و بەو ئەزموونەدا تێنەپەڕن زانینیان لە بارەیەوە نابێت، کە مردیشن لێرە نابن

زانیارییەکەیان بە ئێمە بگەیەنن. ئەو پزیشکانەی ڕۆژانە دەڕواننە کارەساتی مردنی نەخۆشەکانیان لە دەرەوەی ئەزموونی نەخۆشەکانەوە کارەساتەکە دەبینن و نازانن نەخۆشەکان بە چ ئەزموونێکدا تێدەپەڕن. بۆ ئەوان مردن وەستانی دڵ و لە کارکەوتنی مێشکە. ئەم پێناسەیە لە ڕووی زانستی پزیشکیەوە یان زانستیانە دروستە بەڵام پێناسەکردنی فەلسەفیانە نیە. تێگەیشتنی فەلسەفیانە لەسەر ئەم دوو خاڵە ڕادەوەستێت، کە لەم توێژینەوەیەدا ڕونکراونەتەوە: یەکەم دانانی مردن بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیو دووەم مردن وەکو ئەزموونی ناوەکی. گرنگ نیە مرۆڤ بەچی دەمرێت و چ ڕوداوێك مردنی لە بەردەمدا قوتدەکاتەوە. ئەو دەبێ بمرێو ئەزمونی مردنیش ناوەکیو تایبەتە. هەر تاکەکەس ئەزموونی تایبەتی خۆی لە مردندا هەیەو بەتەنیا بەو ئەزموونەدا دەڕوا. ئەمڕۆ هەندێك لە فەیلەسوفەکانی سەدەم، بە تایبەتی ئەوانەی کاریگەری زانستەکان بەسەر بیروباوەڕیانەوە دیارە پەیڕەوی پێناسە زانستیەکە بۆ مردن دەکەن. پیتەر سینگەر لە یەکێك لە کۆڕەکانیدا لەسەر واتای مردن، پاش مشتومڕ مردنی بەوەستانی کارکردنی مێشك دانا.[93] ئەم فەیلەسوفە لە بۆچوونەکەیدا، وەکو پزشکێك دەڕوانێتە کێشەی مردن و هەوڵینەداوە فەلسەفیانە لە واتاکەی بکۆڵێتەوە.

---

[93]- پیتەر سینگەرPeter Singer فەیلەسوفێکی ئوسترالی‌یەو ئێستا لە ئەمریکا دەژیو یەکێکە لە ڕابەرانی بزوتنەوەی بەرگریکردن لە مافی ئاژەڵ. سینگەر ئەم کۆڕەی لە زانکۆی مۆناشساڵی 1997 لە شاری مێلبرن بۆ سازکراو من یەکێك بووم لە بەشدار بووەکان.

نکۆڵی لەوە ناکرێت مردن کۆتایی بە بوون دەهێنێت، بەڵام ڕۆڵی پۆزەتیڤیش دەبینێت. مردن تاك بەرەو تایبەتمەندی و (خۆ)ی ڕەسەن بانگ دەکات.[94] تاك لە بەردەم مردندا، بەتەنیاو بەبێ کەسانی دیکە دەوەستێو پیایدا دەڕوات. کەسانی دیکە بەشداری ئەزموونەکەی ناکەن و ناتوانن بۆ ئەو بمرن. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت مردن تەنیا ئەزموونە تاك بەبێ کەسانی دیکە تیایدا تێپەڕێ. ئەزموونی دیکەش هەیە تاك دەبێت خۆی لە ناویدا بژی. بەڵام هیچ کامێك لەم ئەزموونانە، وەکو مردن هێندە بەزەقیو پڕی(تاکی)و(تەنیا)یی تاك دەرناخات و ناکەوێتە ژوور پەیوەندییەکانی نێوان تاك و کەسانی دیکەوە. ئەزموونی سێکس تایبەتە بە تاکەکەسەوەو تاك خۆی بە ئەنجامی دەگەیەنێت و کەسێکی دیکە ناتوانێت لە باتی ئەو ئەو کارە جێبەجێ بکات. هێشتا لە ئەزموونی سێکسدا، ئەگەر تاك پەنا بۆ ئەندێشەش بەرێت و بەرامبەرەکەی لەوێ نەبێت، ئەو پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیکەدا یان کەسی دووەم ناپچڕێت. لەمردندا تاك پێویستی بەم پەیوەندییە نیەو خۆی بە پڕیو ڕووتی لە ئاستی (هیچ)یان(نەبوون)دا دەبینێو هەموو پەیوەندییەکانی لە ناو دەچن.

بوونی مرۆڤ ناتەواو(کات)یە. بوونێکە بەرەو نەبوون. لە بەرئەمە پێویستە خۆی تەواو بکات و ڕوو لە داهاتوو بکات. داهاتووش بڕیاردان

---

[94]- Martin Heidegger. Op. cit., P.296

و ئەنجامدانی پرۆژەکانی بوونیەتی‌و دەبن بە فاکتۆرە هەڵچنراوەکانی ناوەڕۆك. دابڕانی بوون لەم تەوژمە ژووکێشیەی بەرەو داهاتوو تێکشانی دەسەڵاتی داهێنانەو لەنێو مێژوودا دەبێت بەسەرچاوەی(نامۆ)بوونی تاکەکان. لەو پێگەیەوە نامۆیی دابڕانە لە داهاتوو یان دۆڕانی دەسەڵاتی داهێنان و بڕیاردانە لەسەر پرۆژەکان.

دابڕانی مێژوویی لە داهاتوو ڕوودانەو مرۆڤ دەتوانێت لە ڕەتدانەوەیدا دەسەڵاتەکە بۆ خۆی بگەڕێنێتەوەو سەربەستانە ڕوو لە داهاتوو بکات. مردن، بە پێچەوانەی دابڕانی مێژووییەوە، ئۆنتۆلۆجیانەو لە چارەبەدەرە. بەڵام لەبەر ئەوەی کۆتایی بە بوون دەهێنێت، مرۆڤ تووشی نامۆیی ناکات. نامۆبوون بارودۆخێکی ئاگایانەیەو مردن بێ ئاگایی‌یەکی ڕەهایە. دابڕانی داهاتوو لە حاڵەتی یەکەمدا دیاردەیەکی مێژوویی بڕاوەیە. کەسێکی نامۆ یان کۆیلە، کە لای داگیرکەر بووە بە کەل و پەل و خسڵەتی بوون بە مرۆڤی لێسەنراوە، دەتوانێت لەو بارودۆخە نالەبارە بەسەردا سەپێنراوە یاخی بێت. یاخیبوونی سپارتاکۆس و زنجەکانی خوارووی عێراق ڕەتدانەوەی ئەم دیاردە مێژووییەن.[95]مردن دابڕانێکی

---

[95]- شۆڕشی سپارتاکۆس(71پێش زایین) شۆڕشی کۆیلەکانی دەوڵەتی ڕۆما بوو. شۆڕشەکە سەرنەکەوت و سپارتاکۆس و هاوڕێکانی لە خاچدران. هەروەها شۆڕشی زنجەکانی خواروی عێراق بە سەرۆکایەتی محەممەدی کوڕی عەلی(یەکێك لە کۆیلەکان)لە ساڵی 869 دژی دەوڵەتی عەبباسی بەرپا کرا. ئەم شۆڕشە لەماوەیەکی کورتدا ناوچەکانی خواروی عێراقی لە بەسرەوە تاکو واست داگیرکردو کۆیلە ئازادکراوەکانیش شاری موختاریان نزیك بەسرە بۆ خۆیان دروستکرد. لە ساڵی

سەرمەدی مرۆڤەو بە دوا قۆناخی دەگەیەنێت و بوونی تەواو دەکات. تەواوبوونی بوون لە لایەکەوە پڕی بەبوون دەبەخشێ چونکە پاش مردن چ پڕۆژەیەکی دیکە نامێنێ بە ئەنجام بدرێت و بوونیش دەبێت بە(هەبوو)و دەتوانرێت پێناسەبکرێت. لە لایەکی دیکەشەوە ئەم تەواوبوونە بە تەواوکۆیی دانانرێت. ئەگەر مردن ڕوونەدات گەلێك پڕۆژەی دیکە لە داهاتوودا دێنەکایەوەو مرۆڤ بە ئەنجامیان دەگەیەنێت. مرۆڤ تاکو دەمرێ لە پڕۆژە دانان بەردەوامەو بەناو پڕۆسەی خۆتەواوکردندا دەگوزەرێ. لەبەر ئەم هۆکارە پێناسەکردنی بوونی نەگونجاوە. ئەمەش ڕەتدانەوەی هەڵسەنگاندن و حوکمدان بەسەر هەڵۆێستەکاندا نیەو گشتگری بوونیش لە بەر ڕۆشنایی هەڵوێستێکدا ناخوێنرێتەوە. حوکمدان، کە وابەستەیە بە چیەتی هەڵوێستەوە، وەکو هەڵوێست مێژوویی و دیاردەیەو لافی ڕەهایەتیو هەمیشەیی لێنادات. بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەشەوە، حوکمدان دەبێت بە نکۆڵی کردن لە گۆڕانکارییەکانی داهاتوو، کە تەنیا مردن دەتوانێت ئەم حاڵەتە پەیدا بکات.

مردن پەیوەندی ناوەکی بە مرۆڤەوە هەیەو لە دەرەوەی بووندا نابینرێت و ناناسرێت. مردن لە دەرەوەی بووندا پەیدا نابێو سارتەر گوتەنی، وەکو

883 ئەلموهتەدی خەلیفەی عەبباسی هێرشی کردە سەر شارەکەیان و زۆربەی کۆیلەکان کوژران و سەری براوی محەممەد کوڕی عەلی بە دیاری بۆ خەلیفە ڕەوانەکرا.

کرمی ناو دەرخت لەناو بووندا دەژی.[96] مرۆڤ مردن لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە جیهانەوەو لە ناو بوونی خۆیدا هەڵیگرتوە. بوون و نەبوون یان ژیان و مردنی دوو ڕووی پێکەوە بەستراوی ڕاستیەکن و بەبێ یەکدی نابن. بوونی مرۆڤ نەبوونیشەو لە یەکەم ساتی بوونەوە نەبوونی هەوڵی داگیرکردنی بوون دەدات و بوونیش لەژێر دەسەڵاتی نەبووندا بێهوودە هەوڵی خۆ تەواوکردن دەدات. چۆنیەتی پەیوەندی مردن بە بوونەوە لە بەر ئەوەی ناوەکیەو دەبێ لە ناوەوە بناسرێت، ڕێگرە لە ئاستی پەیداکردنی زانین لە بارەی مردنەوە. پەیوەندی ناوەکی خسڵەتی خۆیی بە ئەزموونی مردن دەدات و لە بابەتگەری دووریدەخاتەوە. بێجگە لەمەش لەگەڵ ڕوودانی ئەزموونی مردندا تاك لێرە نامێنێ تاکو لە چیەتی زانینەکەی بدوێ. با جارێکی دیکە بۆ ڕوونکردنەوەی باسەکەمان بگەڕێینەوە بۆ لێکۆڵینەوەی زانستیانە بۆ مردن. ئاماژەمان بۆ کرد، پزیشکێك لە مردنی نەخۆشێکدا باسی وەستانی دڵمان بۆ دەکات و زانستیانەش دەیسەلمێنێ دڵی نەخۆشەکە لە لێدان کەوتووەو مردووە. لێرەدا پزیشکەکە لە دەرەوەی ئەزموونی نەخۆشەکەوە دەڕوانێتە مردن. ئەو ناتوانێ، وەکو نەخۆشەکەی لە مردن بگات و بزانێ ئەزموونی مردن لای نەخۆشەکەی چۆن بووە یان ئەو نەخۆشە بەچی ئەزموونێکدا تێپەڕیووە. جیاوازی نێوان زانینی نەخۆشەکەو پزیشکەکە سەبارەت بە مردن لە گەڵ جیاوازی نێوان زانینی

---

[96] - Jean-Paul Sartere. *Being and Nothingness*, P. 23

میتافیزیکیو زانستیانە لای هێنری برگسۆن(1859-1941)بەراوەرد دەکرێت. بۆ برگسۆن زانینی میتافیزیکی سەرچاوەکەی حەدەسەو شیکردنەوەشی ئەو زانینە دەکات بە زانستیانە. شیکردنەوەی بابەتێك یان ڕووداوێك شیکەرەوەکە لە دەرەوەی بابەتەکە ڕادەگرێو پەیوەندییەکی دەرەکی بەسەردا دەبڕێ.[97] بێگومان کەسێکی مردوو ناتوانێت باسی ئەزموونەکەی بکات، بەڵام گریمان نەخۆشەکە پێش مردنی چۆنیەتی ئازارەکەیمان بۆ شیدەکاتەوە. ئێمە لەدەرەوەی ئازاری نەخۆشەکەدا بە بەراوردکردنی ئازارەکەی لەگەڵ ئەزموونی ئازارەکانی خۆمان و بە ڕێگەی شیکردنەوەکەی ئەو تا ڕادەیەك لە ئازاری نەخۆشەکە دەگەین. بەڵام زانینەکەی ئێمە سەبارەت بە ئازاری نەخۆشەکە پڕو تەواو نیە. بەم شێوەیە دەزانین مرۆڤ دەمرێو مردن پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی، ئەمەش زانینێکی لە گومان بەدەرو بەڵگە نەویستەو فەلسەفیانەیە بەڵام زانستیانە نیە. زانینی زانستیانە لە سەر زەمینەی ئەزموونگەری خۆی ڕادەگرێت و دەبێت ڕاستی و دروستی حوکمدانەکەی بە ئەزموون بسەلمێنێت. سەلماندنی دەستەواژەیەك وەکو(هەموو مرۆڤێك دەمرێ.)زانستیانە کارێکی محاڵە.

[97]- Keith Ansell Pearson and John Mullarkey. *Henri Bergson: Key Writings,* London: Continuum, 2002. PP. 61-63

پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکان پەیوەندی پێویستیان لەگەڵ یەکدی هەیەو پێکەوە گرێدراون. بۆ نموونە نیگەرانیو داهێنان و مردن ئەگەر بەوردی ئاوڕیان لێبدەینەوە دەبینین لە یەکدی ناپچڕێن و جیا نابنەوە. مردن (کات)یەتیی بوون و بڕانەوەی دەردەخات. ئەم ئاگاییە هاندەرە بۆ نیگەرانیمان بۆ بوون و داهێنانی پڕۆژەکانی. من دەزانم دەمرم و هەرکاتێك بێت زوو یان درەنگ مردن بوونم تەواو دەکات. لە بەر ئەمە بە نیگەرانییەوە هەلسوکەوت لەگەڵ بووندا دەکەم و دەمەوێت پێش مردن پڕۆژەکانم بە ئەنجام بگەیەنم و بەزوترین کات و کورتترین ڕێگا خۆم بە داهاتوو بگەیەنم. ئاگا هاتنەوە لە مردن و پەیوەندییە پێویستەکەی لەگەڵ پێشمەرجە ئۆنتۆلۆجیەکانی دیکەدا ڕەشبینی شۆپنهاوەرانەو تەسلیم بوون بە زویری نیە. دروستە مردن کاڵای بێهودەیی بە بەری بووندا دەکات بەڵام چۆکمان پێدانادات و لە جەنگە بەردەوامەکەماندا ئاڵای سپیمان پێ بەرز ناکاتەوە. بە دوو شێوە واتای مردن لە بێهودەیی بوونەوە لێکدەدرێتەوە: یەکەمیان لەو باوەڕەوە، کە مرۆڤ دەمرێ، بوون بە بێ واتاو بێهودە دادەنێت و گوایە پێویست ناکات مرۆڤ خۆی ماندوو بکات و هەوڵی داهێنانی گۆڕانکارییەکان بدات. دووەمیان ئەو لێکدانەوەیەیە ئێمە لە توێژینەوەکەماندا پەیڕەوی دەکەین و لەو ڕوانگەیەوە دەڕوانێتە کێشەکە، کە مردن و نیگەرانی و داهێنان لە یەکدی

جیاناکاتەوەو مردن بە هاندەری داهێنانی ناوەڕۆک و تەوژمە ژوورکێشیەکەی بوون بەرەو داهاتوو ناوزەد دەکات.

بەشی پێنجەم

# پاش نیهیلیزم

بوونی لە مەبەست بەدەر بێکەڵکەو واتایەکی لە پێشتری پێنەدراوە. ئەم بێکەڵکی‌یە لە هەمانکاتدا بناخەی مێتافیزیکی خۆی هەیەو لە سەر ئۆنتۆلۆجی نیهیلیستی دامەزراوە. ڕەتدانەوەی بوونی سەدەمێکی هۆشەکی‌یە، لە پێشتردا نەخشەو هێڵکاری بوونی کێشابێت وگۆڕانکارییەکان پەیڕەوی بکەن. ئەم ڕەتدانەوەیەش ئێمە لە ئاستی هیچگەری ڕەهادا ڕاناگرێ‌و لە بنەڕەت بەدەر نیە. بۆ نموونە لە بەشی یەکەمی توێژینەوەکەماندا باسمانکرد(بوون) بنەڕەتی هەموو شتێکەو خۆشی لە بنەڕەت بەدەرە. هەروەها ئەو خاڵەشمان ڕوون کردەوە، لە بەر ئەوەی بوون بنەڕەتێکی لە بنەڕەت بەدەرە سەدەمەکی هۆشەکی لە پێشتری بۆ دانانرێت. لە ئاکامی ئەم توێژینەوەماندا دەگەینە ئەو باوەڕەی بوون بێ واتایەو هەر واتایەکیشی بۆ دابنرێت ئەوا لە پاشترو داهێنراوی ئاگامەندییە.

بێگومان نیتشه له دامەزراندنی مێتافیزیکیە نیهیلیستیەکەیدا، لەگەڵ گۆڕانکارییەکانیشدا بە سەریدا هێناوە، لۆجیکمەندانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کێشەکەدا کردووە. کەسێك پەیڕەوی مێتافیزیکی نیهیلیستی بکات خۆی بە گەڕان بەدوای سەدەمی هۆشەکیو بنەڕەتدا ماندوو ناکات و هیچگەریانە دەڕوانێتە بنەڕەت و سەرچاوەی بوون. بەڵام ئێمە چۆن هیچگەریانە بیر بکەینەوەو باوەڕیشمان بە بنەڕەت هەبێ؟ ئایا ئەمە ناکۆکی لە ناو توێژینەوەکەمان پەیدا ناکات؟ سەرنجدانێکی سەرپێی بەسەر پڕۆژەکەماندا جۆرە ناکۆکیەك دەهێنێتەکایەوە، بەڵام ئەگەر بەوردیی و قوڵی بڕوانینە کێشەکە ئەو ناکۆکیەش لە ناو دەچێت. ئەو خاڵە گرنگەش دەخاتە ڕوو، کە توێژینەوەکەمان لە هەڵوێستە نیهیلیستیەکەیەوە خۆی بە قۆناخی پاش نیهیلیزم بگەیەنێو بەردەوامی بە گەشتە فەلسەفیەکەمان بدات. هیچ بۆ چوونێکی نیهیلیستیانە نیە هەوڵی خۆ گەیاندنی بە قۆناخێکی دیکە نەدابێت. تەنانەت نیتشە خۆی بە داتاشینی بەها و واتاوە ماندوو کردووە. ئێمەش دەڵێین پێویستە بوونێك هەبێت لە ڕەهەندێکی ئۆنتۆلۆجیەوە لەواتای بێکەڵکی بکۆڵێتەوەو بێواتاییەکەی بسەلمێنێت .[98] سەپاندنی بوونێك بەم ڕەهەندە ئۆنتۆلۆجیەوە دۆگمای مەبەستی لە پێشتر ناگەیەنێت چونکە ئەم

[98]- مرۆڤ یان بوون- بۆ- خۆ تاکە بوونێکە، کە خاوەنی ڕەهەندی ئۆنتۆلۆجیەو پرسیار لە واتای بوون دەکات و لێی دەکۆڵێتەوە. ئەم خسڵەتەش یان ڕەهەندە ئۆنتۆلۆجیە جێگایەکی تایبەت لە توێژینەوەکەماندا بۆ بوونی مرۆڤ دادەمەزرێنیو دەیکات بە پێشەوای گەشتە فەلسەفیەکەمان.

بوونەش بنەڕەتی لە پێشتری هەیەو ناتوانێت مەبەست و واتای لە پێشتر بۆ بوون دابهێنێت. ئەوەی لە تواناو دەسەڵاتی ئەمدایە داهێنانی واتاو مەبەستی لە پاشترە. لەبەر ئەمە بۆ چوونە نیهێلێستیەکەمان تاکو ئەوێ دەڕوات، کە بوون بە بەدەر لەمەبەست دادەنێت، بەڵام ناتوانێت بوون بە هیچ بداتە قەڵەم چونکە بۆ گوتنی ئەمە(بوون هیچە)، پێویستە(من) هەبم تاکو هیچی بوون بسەلمێنم.

لە مەبەست بەدەری یان بێکەڵکی بوون نیهێلێستێکی ئۆنتۆلۆجیەو سەرچاوەی نیهێلێستی ئاکاریو ئەپستمۆلۆجیەو ئەم دوو بەشەی دوایی پەیوەندییەکی پێویستیان بەیەکەمەوە هەیە. لە مەبەست بەدەری بوون کارتێکردنی ڕادیکاڵی بەسەر بەها ئاکارییەکان و ناوەڕۆکی زانینەوە هەیەو دەیانگۆڕێت. لەژێر ئەم کارتێکردنەدا بناخەی هەمەکی بۆ بەها و زانین دەڕوخێو ئەوەی دەمێنێتەوە بەها و زانینی هەندەکیە، کە بە گوێرەی کات و شوێن و تاکەکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت و بۆ هەمیشەش ڕاست و دروست نامێننەوە. ئەمەش پەیوەندییەکی لۆجیکمەندانەی بەو پێگەیەوە هەیە، کە ڕەتی مەبەستی لەپێشتر بۆ بوون دەداتەوە. خۆ ئەگەر مەبەستێکی لەپێشتر هەبوایەو لە لایەن دەسەڵاتێکی مێتافیزیکیەوە(سەدەمی هۆشەکی)ئەو مەبەستە دابنرایە دەبوایە، وەکو دەسەڵاتە مێتافیزیکیەکە داهێنەرەکەی هەمەکی بوایەو بە مێژووەوە

نەبەسترایەتەوە. چونکە مرۆڤ مێژوویی‌یەو بەها و زانینەکانیشی لە ناو بازنەی مێژوو دەرناچن. داماڵینی دەسەڵاتی لەپێشترو مەبەست دەر بەم شێوەیە هەڵوەشاندنەوەی بناخەی ڕاستیە لە مێژوو بەدەرەکانەو ڕەتدانەوەی بەها و زانینی نەگۆڕو هەمیشەیی‌یە. لە سەرو ئەمانەشەوە ڕێگە نادات بێکەڵکی ببێت بە دەسەڵاتدارێکی ڕەهاو ترسناك بۆ ڕەهەندەکانی بیرکردنەوەو توانای داهێنان کەمبکاتەوە. لە بێکەڵکیەوە بەرەو داهێنانی واتاو لە نیهێلیزمەوە بەرەو پاش نیهێلیزم ڕێگە بۆ توێژینەوەکەمان خۆش دەکات.

لەم ڕووەوە خۆمان دەگەیەنینە قۆناخێکی پۆزەتیڤی پێشکەوتووتر. بوونمان بە لە مەبەست بەدەر دانا، بەڵام ئەو بوونەشمان کرد بە بنەڕەت و کێشەکانی دیکەمان پێوەگرێدا. (بوون)یش لە لایەکەوە بەرزو ترانسێدنتاڵەو لە لایەکی دیکەوە لە ناو هەموو شتێکدایە.[99] ترانسێدنتاڵی بوون بە دوو شێوە لێکدەدرێتەوە؛ یەکەم ڕاستیەکی ئۆنتۆلۆجییەو بوونی هەمووشتێکەو هیچ لەو شتانەش نیە. دووەم بنەڕەتێکە بۆ بوونی(من)و مێزەکەو قاوەخانەکە. من و ئەم شتانە هەن بەڵام هێشتا (بوون) شتێك نیە وەکو(من)و (مێز)و (قاوەخانەکە) بناسرێ‌و پەنجەی بۆ ڕابکێشرێت. لەبەر ئەمە ڕاستیەکی بەرزەو بەرزییەکەشی لەوەدا نیە، وەکو جیهانی

[99]- مارتن هایدیگەر (بوون) بە ترانسێندت و سادە و تایبەتمەند دادەنێت.

ئایدیای ئەفلاتون و نۆمینای کانت لە داکەوتی مرۆڤایەتی دابڕابێت. (بوون) لە ڕوانگەی ئەپستمۆلۆجی (کانت)ییەوە ترانسێدنتاڵە.[100]

بۆ کانت بابەتەکانی ژوور دەسەڵاتی ئەزموونی هەستەکیو تێگەیشتن بە ترانسێدنتاڵ دادەنرێن.[101] بوون بەگشتی وەکو *(Sein)* بۆ هایدیگەرو (الوجود) لای ئیبن عەرەبی و مەلا سەدرا داکەوتێکی هەندەکی نیەو ناکەوێتە بەر ڕۆشنایی ئەزموونی هەستەکیەوە. تاکو ئێرە ئێمە سودمان لە بۆچوونەکەی کانت وەرگرتووەو چەمکەکانیمان بەکار هێناوە. لەوێدا خۆمانی لێ دوور دەخەینەوە، کە هەوڵدەدات ئەو بوونە بە ڕاستیەکی مێتافیزیکی لە ئەستو بەدەرەوە ببەستێتەوەو لەو ڕاستیە مێتافیزیکیەشەوە بگاتە ئەو باوەڕەی (خۆ)ی مرۆڤیش بەشێکی ڕاستیەکەی بەر کەوتووە. دەردەکەوێت ئەم فەیلەسوفە نەیتوانیوە بە بێ هەڵسەنگاندن و ڕەخنەسازی لە کێشە فەلسەفیەکان بدوێ. بەتایبەتی لە بەشی سێیەمی پەڕتووکەکەیدا *Critique of Pure Reason* گەیشتۆتە ئەو ئاکامەی سەلماندنی مێتافیزیك یان ڕاستیە دوورەکان وەکو بوونی خواو گیانی مرۆڤ دژوارەو لە هەمانکاتدا باوەڕی بە ڕاستی لە

---

[100]- ئەم چەمکانە بە تایبەتی (ترانسێندت)و(سادە) بە بیروڕای من هەرچەندە هایدیگەر لە (کانت)ەوە وەریگرتوون ئەفلاتون بەکاری هێناون و پێناسەی فۆرە ئایدیالیەکانی پێکردووە. بۆ نموونە ئەفلاتون چاکەی بە بەرزو سادە داناوە. با ئەو خاڵەشمان لە بیر نەچێت، کە هایدیگەر بۆچوونی لەگەڵ ئەفلاتون و کانت جیاوازەو لە گەڵ سیستەمە مێتافیزیکیەکەیان هاوڕا نیە.

[101]- Immennel Kant. Op. cit., A: 22, B: 37

ئەستوبەدەر(نۆمینا)و (خۆ)ی بەرز یان ترانسێدنتاڵ لە بوونی مرۆڤدا هێناوە. بە گوێرەی بیروباوەڕی کانت هەموو تاکێك خاوەنی دوو(خۆ)یە: ترانسێدنتاڵ و ئەزموونی. یەکەمیان لە ژوور دووەمەوەیەو پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە داکەوت و ئەزموونەکانەوە نیە. ڕۆڵی ئەم خۆیە پەیداکردنی (یەکێتی)و گرێدانی ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی خۆی دووەمەو هەموو ئەو ئەزموونانە لە بوخچەی ئاگایی تاکە کەسێکدا کۆدەکاتەوە. ئەگەر خۆی ترانسێدنتاڵ نەبێ ئەو کەسە دەبێت بە خاوەنی (فرەکەسی)و ئەزموونەکانی ڕابردوو و ئێستاو داهاتووی پێکەوە نابەسترێ. خۆی دووەم(ئەزموونی)بە ئەزموونەکانی ڕۆژانە هەڵدەستێو پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ داکەوتدا هەیە. بەڵام بەبێ خۆی ترانسێدنتاڵ ئەو ناتوانێ ئەزموونەکان پێکەوە گرێبدات.[102]

بۆ کانت ترانسێدنتاڵی خۆ پێویستیەکی ئەپستمۆلۆجیەو ڕۆڵی سەرەکی ئەو گرێدانی ئەزموونەکانە بە یەکدییەوە تاکو ئاگایی تاکەکەس نەپچڕێو بەردەوام بێ. لەبەر ئەوەی لەژوور دەسەڵاتی ئەزموونەکانەوەیە بە ترانسێدنتاڵ دادەنرێت و هەستکردن نایناسێت.

ibid., A: 107, 108 -[102]

ئێمە ئەو بناخە مێتافیزیکیەی کانت بۆ خۆی ترانسێدنتاڵ دایدەمەزرێنێ ڕەتدەدەینەوە. لەو باوەڕەداین ئەوەی یەکێتی لە ناو ئەزموونەکاندا پەیدا دەکات و بە یەکدیەوە گرێیان دەدات ئاگامەندییە. ئاگامەندیش تەوژمێکی بەردەوام و نەپچڕاوی ژوورکێشەو بەبێ (غافڵ) بوون لە خۆی ڕوودەکاتە جیهانی دەرەوەی. ئاگامەندی بە ئاگاوە پەیوەندی لە نێوان ئەزموونەکانی ڕابردوو و ئێستاو داهاتوو هەڵدەبەستێو یەکێتی تاکەکەسیش دەخاتەڕوو. بۆ نموونە ئاگامەندی من بەردەوام ڕوو لەدەرەو بابەتەکان ناسدەکات. من دەزانم ئەوەی ڕوو لە و بابەتانە دەکات و هەوڵی ناسینیان دەدات منە. ئەگەر من نەزانم، من ڕوو لەو بابەتانە دەکەم و ئاگام لە خۆم نەبێت و ئاگامەندیم هەست بە بوونی خۆی لە ئاستی بابەتەکان نەکات ئەوا ناتوانم خۆم بە خاوەنی ئەو ئاگاییەو ئەزموونە دابنێم. خۆ- ئاگایی، کە سارتەر ناویدەنێ *Pre-reflective Cogito* پێشمەرجێکی پێویستی پەیداکردنی زانینە.[103] ئەمەش ڕەتکردنەوەی کۆجیتۆکەی دیکارتەو گۆڕانکارییەکی فەلسەفی گرنگە سارتەر خستویتە گەڕ. (کانت)یش هەستی بە کەموکورتی کۆجیتۆکەی دیکارت کردووە بەڵام، وەکو سارتەر چارەسەری گرفتەکەی نەکردووەو پەنای بۆ خۆی- ترانسێدنتاڵ بردووە. ئەو کارە جارێکی دیکە تووشی ڕێچکەی دوانەکی کردووەو لە ژێر کاریگەری نەریتی دیکارتی ڕزگاری نەکردووە.

---

[103]- هەروەها بڕوانە: محەمەد کەمال، فەلسەفەی سارتەرو خوێندنەوەیەکی نوێ، Jean- Paul Sartre. Op. cit., P. xxx

نیتشه گوتەنی "کاتی لەدایکبوونی (سوپەرمان)هاتووە"و [104] قۆناخە مێژووییەکەمان سەدەمی داهێنانە. لە دایکبوونی سوپەرمان و سەدەمی داهێنان ئاکامی لۆجیکمەندانەو پێویستی مێژوویی پرۆژەی نیهێلیستی ئۆنتۆلۆجیە. بیرۆکەی بوونی سەدەمی هۆشەکی مەبەستدەر(بوون) لە مێژوو دادەبڕێو دەستەیەك بەهاو زانینی پێشوەخت و نەگۆڕی بەسەردا دەسەپێنێ. بە پێچەوانەی ئەم بیرۆکەیەوە، نیهێلیستی ئۆنتۆلۆجی مێژوو بە شانۆگەری خۆ دەرخستن و تەوژمە ژوورکێشیەکەی بوون دادەنێ.

ئاشکرایە هەموو سەدەمێك سیستەمێکی زاڵبووی مێتافیزیکی خۆی هەیە. مێتافیزیکی ئەریستۆ بۆ ماوەیەکی زۆر دەسەڵاتی بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفەی ڕۆژئاوادا ڕاگرت. سیستەمی ئەریستۆ جیاوازییەکی ناوەڕۆکی لەنێوان بوونێکی نەگۆڕو لەسەدەم بەدەرو بوونێکی بڕاوەو ناتەواودا دیاری دەکات. هەرچەند ئەریستۆ بەچاوی ڕەخنەگرانە ڕوانیویەتە فەلسەفەی ئەفلاتون، بەڵام لەم جیاکردنەوەیەدا کارتێکردنی بۆچوونە مێتافیزیکیەکەی ئەفلاتون ڕوون و ئاشکرایە. لە جیهانی ئایدیاڵی ئەفلاتوندا فۆڕمە هەمەکیەکان نەگۆڕو پڕو تەواون و لەم ڕووەوە گۆڕانکاری لە ناو ئەم جیهانەدا نابێ ڕووبدات، چونکە

---

[104] Friedrich Nietzsche. *Thus Spake Zarathustra*, translated by Thomas Common, - Wordsworth Classics, 1997. P. 276

گۆڕانكاری ئاماژە بۆ ناتەواوی‌و كەموكورتی دەكات و فۆڕمەكان ئەم خسڵەتەیان نیە. گۆڕانكاری خسڵەتی بوونێكی هەندەكی‌و بڕاوەو ناتەواوە. پاش ئەریستۆ، هیگڵ هەوڵی داوە ئەو قۆناخە ببڕێ‌و گۆڕانكاری‌یەكی مێتافیزیكی داهێنێ‌و ئەریستۆ رەت بكاتەوە. هەنگاوی سەركەوتوانەی هیگڵ لەم بارەیەوە لەوێدا دەردەكەوێت، كە بوون و مێژوو پێكەوە گرێدەدات و لێكدانەوەیەكی زانستیانە بەبوون دەدات. هیگڵ، وەكو ئەریستۆ بوێرانە باسی گۆڕانكاری دەكات بەڵام ئەو گۆڕانكاری‌یە بە تەنیا بە خسڵەتی لایەنێك یان جۆرێك لە بوونی دانانێ. كەموكورتیەكەی بیروباوەڕی هیگڵیش لەوەدایە، ئەم فەیلەسوفە نەیتوانیوە بە تەواوی خۆی لەژێر كارتێكردنی ئەریستۆ ڕزگار بكات و دەبینین گۆڕانكاری‌یەكان بۆ ویست و مەبەستی ئاگامەندی ڕەها *Geist* دەگەڕێنێتەوەو مێژوو بە خۆ نواندنی ئەو ئاگامەندییە دادەنێت و چاوپۆشی لە ویست و ڕۆلی تاكەكان دەكات و سیستەمێكی ناچارەكی دادەمەزرێنێت. ماركس و نیتشەو هایدیگەر گۆڕانكاری پێشكەوتووتریان لە بیرو باوەڕی مێتافیزیكی سەدەمدا پەیدا كردو توانیان ژوور كەموكورتیەكانی فەلسەفەی هیگڵ بكەون و كارتێكردنی ئەریستۆ بەسەر بیرۆكەی فەلسەفی سەدەمەوە بسڕنەوەو بانگەشەی پەیوەندییەكی پێویستی لەنێوان بوون و مێژوودا بكەن. بۆ ماركس كۆتایی هێنان بە مێتافیزیكی بۆرژوازی‌و ڕوخاندنی دەستگای خاوەندارییەتی تایبەتی‌و

کۆمەڵگای چینایەتی بەهێزکردنی ئەو پەیوەندییەی نێوان بوون و مێژوو دەخاتەگەڕ. بۆ نیتشە لەدایك بوونی (سوپەرمان)ئاماژە کردنە بۆ سەقامگیرکردنی پەیوەندییەکەو بەتەنیا سوپەرمان دەسەڵاتی داهێنانی گۆڕانکارییەکانی ناو مێژووی هەیە. هایدیگەر، پاش کەڵك وەرگرتن لەم بۆچوونانە، زیاتر جەختی لەسەر ڕۆڵی مرۆڤ بۆ داهێنانی گۆڕانکارییەکان کردو لێکدانەوەیەکی نوێی بەزمانی فەلسەفی نوێ بۆ بوونی مرۆڤ کرد. بە دیتنی هایدیگەر مرۆڤ بوونێك نیە لە دەرەوەی گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوودا بێ‌و تەماشاکەرێك بڕوانێتە مێژوو. ئەو بوونێکی مێژوویی هەیەو مێژووش چیرۆکی بوونی ئەوە. بوونی مرۆڤ لەناو جیهاندا، وەکو پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی، سێ لایەنی گرنگی ئەم بوونە ڕووندەکاتەوە: جیهانگەری‌و کۆمەڵگەری‌و کاتیەتی بوونی. جیهانگەری بوونی مرۆڤ بە گوێرەی بۆچوونی هایدیگەر ناسنامەی (گیانەکی )ئایدیالیستیانەی لێدەستێنێ‌و دەیکات بە هاووڵاتیەکی جیهانی. ژیان و مردنی مرۆڤ لەناو جیهاندایەو لە دەرەوەی جیهان چی دیکە نیەو پرۆژەکانی بوونیش لێرە (لەناو جیهان)دا بە ئەنجام دەدرێن. مرۆڤیش لە ناو جیهاندا تەنیا نیەو لە گەڵ کەسانی دیکە دایەو ئەوانیش پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجین بۆ بوونی. هەڵوێستی لەگەڵ ئەوانداو داهێنانی پرۆژەکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و گۆڕانکارییە مێژووییەکان دەهێننە کایەوە.

ئەمەش ڕوونی دەکاتەوە، سەدەمەکەمان خاوەنی بیرکردنەوەی میّتافیزیکیانەی خۆیەتی. لە کاتێکدا باسی ڕوخاندنی میّتافیزیك دەکەین مەبەستمان کۆتایی هێنانە بە شێوازی میّتافیزیکی کۆن، بە تایبەتی شێوازی ئەریستۆیانە یان تیۆ-ئۆنتۆلۆجی. میّتافیزیك، بەم شێوەیەی باسی دەکەین و لە ناو بیرۆکەی سەدەمدا دەژی، سەپاندنی دەسەڵاتێکی هۆشەکی لەپێشترو نەخشەدانەر نیە. بنەڕەتێکی پێویستە بۆ سەرهەڵدانی ڕووداوەکانی مێژوو. بۆ نموونە مارکس و نیتشەو هایدیگەر ئاماژەی بنەڕەت یان زەمینەیەکیان بۆ گۆڕانکارییەکان کردووە. جیاوازی نێوان بۆچوونە میّتافیزیکیەکەی ئێمەو ئەریستۆ یان میّتافیزیکی تیۆ-ئۆنتۆلۆجیو نیهێلێستی ئۆنتۆلۆجی لە ڕەت دانەوەی تیۆلۆجیو بەستنەوەی بوون بە مێژووەوەیە. تیۆ- ئۆنتۆلۆجی باوەڕی بە بوون لە دەرەوەی بازنەی کاتدا هەیەو ئەو بوونەش مەبەست و واتا بە مێژوو دەدات. نیهێلێستی ئۆنتۆلۆجی بوون بە (کات)و (مێژوو) دادەنێ.

دەسەڵاتی داهێنەری گۆڕانکارییەکان و مەبەستدەر(غایەدەر) بە مێژوو و ئاگامەندییە. بوونێکی لە ئاگا بەدەر ناتوانێ مەبەست بە مێژوو بدات و گۆڕانکارییەکان داهێنێ. مێژوو، لەم بۆچوونەوە، تەوژمی ژوور کێشی ئاگامەندییەو گۆڕانکاری ئاگامەندانەیە بەرەو داهاتوو. ئاگامەندیش بیرکردنەوەو ویستی تاکەکانە، وەکو ئاگامەندی ناو فەلسەفەی هیگڵ

ڕەهاو هەمەکی نیە. لە ناو پرۆسەی گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوودا مەبەست و بەها و واتای قۆناخەکان یان گۆڕانکارییەکان داهێنراوی ویستی تاکەکانە، کە بە بەردەوامی پرۆسەکە دەخەنە گەڕ. بەردەوامی درێژەپێدانی مەبەست و بەها و واتای قۆناخێك نیەو بەڵکو نوێکردنەوەو داهێنانی مەبەست و بەها و واتای دیکەیە. قۆناخەکان پێویستی تایبەتمەندی خۆیان هەیەو ئەو پێویستیە لە قۆناخێکی دیکەدا نا-پێویست دەبێت و ئەگەر ڕەت نەدرایەوە یان ڕەت نەکرایەوە دەبێت بەربەست کۆسپ لە ئاستی تەوژمە ژوورکێشیەکەی ئاگامەندیدا. بەم شێوەیە دوا قۆناخ لە مێژوودا نیەو گۆڕانکارییەکان بە بەردەوامی ڕەوت دەکەن. ئەمەش تارادەیەك لەگەڵ توێژینەوە دیالێکتیکیەکەی هیگڵدا هاوڕایە بەڵام لەو خاڵەدا ناکۆکە، کە هیگڵ لە ژوور گۆڕانکارییەکانەوە باوەڕ بە ئاگامەندیی ڕەها دەهێنێ‌و ئەویش مەبەست و بەها و واتای لە پێشتر بە گۆڕانکارییەکان دەدات. هەروەها هیگڵ ئاماژەی دوا قۆناخی مێژوومان بۆ دەکات و گوایە گۆڕانکارییەکان بە دوا قۆناخ دەگەن و لەوە زیاتر بوون گۆڕانی بەسەردا نایەت. ئەو دوا قۆناخەش بە بیروڕای ئەم فەیلەسوفە بە سەرهەڵدانی کۆمەڵگای بۆرژوازی پەیدا دەبێت. مارکس، وەکو شاگردێکی هیگڵ، بە هەمان شێوە، واتە بە گوێرەی گۆڕانکارییە دیالێکتیکیەکانی ناو مێژوو، لاری لە بۆچوونەکەی هیگڵ نیەو باوەڕی

به کۆتایی مێژوو هێناوە.[105] مارکس لە دوو ڕووەوە ڕادیکاڵتر هەڵسوکەوتی لە گەڵ گۆڕانکارییەکانی مێژوو کردووەو هیگڵی ڕەتکردوە.

یەکەم، ئەو گۆڕانکارییەکانی مێژوو بۆ دەسەڵاتی ئاگامەندی ڕەها ناگەڕێنێتەوە. دووەمیش، هەوڵی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی بێ چین دەدات. مەبەستی مێژوو بۆ مارکس لەدەرەوەی مێژوودا نیەو دەسەڵاتی هەڵسوڕانی گۆڕانکارییەکان (وەکو چینی بەرهەم هێنەر) بە گوێرەی پێویستی قۆناخەکە پەیدای دەکات. کێشەی (کۆتایی مێژوو)، کە لەگەڵ ناوەڕۆکی سیستەمی دیالێکتیکیدا ناکۆکە، چونکە دیالێکتیك داکەوت بە دینامیکی ناوزەد دەکات، بەستراوە بە سەرهەڵدان و لەناو چوونی لایەنە دژەکان. بە دیتنی هیگڵ و مارکس گۆڕانکارییە دیالێکتیکیەکەی مێژوو خۆی دەگەیەنێتە قۆناخێك دژەکان لەناویدا وون دەبن و نامێنن. لەبەر ئەوەی زۆرانبازی نێوان دژەکان دەبێت بە ڕەوڕەوەی گۆڕانکارییەکان، لەو قۆناخە لە دژبەدەرەدا مێژوو دەوەستێو زۆرانبازی کۆتایی پێدێت و قۆناخێکی پڕ لە ئارامیو ئاسودەیی سەر هەڵدەدات. گەیشتن بەم ئاکامەو کۆتایی مێژوو لەم لێکدانەوە دیالێکتیکیەوە

---

[105]- بۆ مارکس کۆمەڵگای کۆمۆنیستی، نەك بۆرژوا، دوا قۆناخی گەشەکردنی مێژووە. بۆ ئەمەش بروانە:
Karl Marx. *Economic and Philosophical Manuscript 1844,* Moscow: Foreign Languages Publishing House, 1975, P. 98

لۆجیکمەندانەیە، بە تایبەتی ئەگەر باوەڕ بە لەناوچوونی زۆرانبازی نێوان دژەکان بهێنین، بەڵام کێشەکە لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەی مێتافیزیکی ئەم دوو فەیلەسوفەدا ناکۆکە، ئەوان لە لایەکەوە بوون بە تەوژمێکی ژووکێشی نەوەستاو دادەنێن و لە لایەکی دیکەوە لە دوا قۆناخ و کۆتایی مێژوو دەدوێن.

سەرەنجامی باس لەوێدا کۆدەبێتەوە، ئێمە لە هەڵوێستە ڕادیکاڵە نیهێلیستیەکەمانەوە ڕوومان کردۆتە پاش- نیهێلیزم. نیهێلیزم بووە بە بیروباوەڕێکی فەلسەفی ڕووخێنەرو داهێنەر. ئەم دوو لایەنەی بیروباوەڕی نیهێلێستی پەیوەندییەکی پێویستیان لەگەڵ یەکدی هەیە. ڕوخاندن لە هەمانکات داهێنانە. خسڵەتی گۆڕانی ڕادیکاڵانەی بیروباوەڕی نیهێلێستی لەم پەیوەندییەدا دەردەکەوێت و بەرگێکی شۆڕشگێڕانە بە باڵای فەلسەفەکەماندا دەکات و هەوڵی داهێنانی مێژوو دەدات. ڕۆڵی سەرەکی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە، لەسەرەتای باسەکەماندا ئاماژەمان بۆکرد خۆ لێدانە لە قەرەی پرسیاری گەورەو داهێنانی گۆڕانکارییەکان. لە هەموویان گەورەتریش پرسیار کردنە سەبارەت بە واتای بوون و داهێنانی ئەو واتایە. ئێمە لە هەڵسوکەوت کردنمان لەگەڵ وەڵامی ئەم پرسیارە گەورەیەدا شێوازی مێتافیزیکی ئەریستۆمان ڕەتدایەوەو

نیهیلیستیانه ڕوومان کرده پرسیارەکەو بوون و مێژوومان پێکەوه گرێداو دەسەڵاتی داهێنانی مێژوومان بۆ مرۆڤ گەڕاندەوە.

مێژوو له ڕوانگەی بۆچوونەکەمانەوه بوو به تەوژمێکی ژوورکێشی ئاگامەندانەو (داهێنان)یش پردێکی پێویسته له نێوان بوون و مێژوودا هەڵیدەبەستین. داهێنان لەم ڕووەوه بوون بەرەو داهاتوو دەبات و ناوەڕۆکێکی پێدەبەخشێ. بوون و داهێنان و مێژوو دەبن به تەواوکەری یەکدیو ئەگەر له یەکدی دابڕێن بوون نامۆ دەبێو ناتوانێت به مێژووبوونی خۆی بسەلمێنێت.

بەشی شەشەم

# بوون و یاخیبوون

گەڕانەوەی دەسەڵاتی داهێنان بۆ بوونی مرۆڤ ئاکامی لۆجیکمەندانەی توێژینەوە ئۆنتۆلۆجیەکەمانەو گۆڕانکارییەکی ڕادیکاڵانەی فەلسەفەفیانەیە، کە جەخت لەسەر ڕۆڵی سەرەکی ئەم بوونە لە مێژوودا دەکات. داهێنانیش پڕۆسەی بونیادنان و پەلکێش کردنی بوونێك لە نەبوونەوەیەو بنەڕەتێکی دیالێکتیکی هەیەو بەبێ(ڕەتدانەوە) یان (ڕوخاندن) نابێت. پڕۆسەی داهێنانی پڕۆژەیەك لە هەمانکاتدا ڕەتدانەوەی پڕۆژەیەکی دیکەیەو بەم جۆرە هەڵوێستی ڕەتدانەوەو نێگێتیڤانە لە ناوخۆدا بوونێکی پۆزەتیڤی هەڵگرتووەو پۆزەتیڤ بەبێ نێگەتیڤ و نێگەتیڤ بەبێ پۆزەتیڤ نابێت. لە بەر ئەوەی پڕۆسەی داهێنان لەبوونی مرۆڤدا نەبڕاوەیە گۆڕانکارییەکانیش لە پۆزەتیڤەوە بۆ نێگەتیڤ و جارێکی دیکە بۆ پۆزەتیڤ بە بەردەوامی دەمێنێتەوەو تەوژمە ژوور کێشیەکەی بوون بەرەو داهاتوو دەخەنەگەڕ. لایەنی نێگەتیڤ، کە ڕەتدانەوەی لایەنی پۆزەتیڤە دەست نیشانی دەسەڵاتی

ڕوخێنەرو داهێنەری بوون دەکات. ئەو خاڵەمان بۆ دەخاتە ڕوو، کە بوون لە گۆڕانکاریی‌و نویێ کردنەوەدایەو بەبەردەوامی خواستی گەیشتن بە قۆناخی باشترو خۆ تەواوکردنی هەیە. لەم شێوازەی بووندا هەبووی لایەنی پۆزەتیڤ و ڕەتدانەوەی ئەو لایەنە پێشمەرجن بۆ هەبووی لایەنی نێگەتیڤی. بەبێ دامەزراندنی ئەم پەیوەندییە لە نێوانیاندا ئێمە ناتوانین لە واتاکانیان بگەین و لە کێشەی ڕەتدانەوەش بدوێین. لەم پێگەیەوە هەوڵ دەدەین واتای یاخیبوون لەبەر ڕۆشنایی داهێنان و ڕەتدانەوەدا ڕوون بکەینەوەو پەیوەندییە ئۆنتۆلۆجیەکەشی بە بوونی مرۆڤەوە بسەلمێنین.

بوونی ناتەواوی مرۆڤ و بێ-ناوەڕۆکی ئەم بوونە زەمینەیەکی ئۆنتۆلۆجی نوێی بۆ تویژینەوەکەمان خۆشکردو گەیشتینە ئەو باوەڕەی بەبێ داهێنان مرۆڤ ناتوانێت ناوەڕۆکی خۆی پەیدا بکات و ببێت بەوەی خۆی دەیخوازێ. بەڵام دوو کۆسپ و ڕێگر: نامۆ بوون و مردن پرۆژەی خۆ تەواوکردن تێکدەدەن. نامۆ بوون، بە پێچەوانەی مردنەوە، دیاردەیەکی مێژووییەو بوون لە نێو ڕابردوودا گلدەداتەوە پێویستی یاخیبوون ئاشکرا دەکات. بوونێکی نامۆ لەبەر ئەوەی کەسانی دیکە بڕیار لەسەر پرۆژەکانی دەدەن و دەسەڵاتی داهێنانی کپ دەکەن بێ داهاتووەو خاوەنی مێژووی خۆی نیە. کەسێك چاوەڕوانی هێزێکی دەرەکی بکات

گۆڕانکارییەکانی بۆ بڕەخسێنێ، نکۆڵی لە دەسەڵاتی داهێنانی خۆی دەکات و بوونێکی ناڕەسەن هەڵدەبژێرێ. لەژێر باریی نەرێی نامۆییدا ڕێگە چارەی گەڕانەوە بەرەو ڕەسەنیەتی بوون یاخیبوونە. ئەمەش یاخیبوونێکی مێژووییە بەلام ئەوەی ئێمە دەمانەوێ ڕوونیبکەینەوە دامەزراندنی نامۆییە لەسەر بناخەی توێژینەوەیەکی فەلسەفیانەیە. نامۆیی بارودۆخێکی ئۆنتۆلۆجی نیەو دیاردەیەکی مێژووییە. ئێمە لەو خاڵە ئۆنتۆلۆجیەوە باسەکەمان دەخەینە گەڕ، کە مرۆڤ بە بوونێکی ناتەواوو داهێنەر دەخوێنێتەوە. ئەم کێشەیەش بەدرێژی لە بەشەکانی پێشوودا ڕوونکراوەتەوەو لێرەدا بە یاخیبوونەوەی دەبەستینەوە. ناتەواوی بوونی مرۆڤ ئێمەی گەیاندە ئەو باوەڕەی بەبێ دەسەڵاتی داهێنان مرۆڤ نەتوانێ خۆی تەواو بکات. داهێنان بوو بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ بوونی. پرۆسەی داهێنانیش یاخیبوونێکی بەردەوام و نەوەستاوە لە چۆنیەتی بوونی ئێستاو ڕابردوو. ڕەتدانەوەی هەبووەکانەو ڕەوتێکی ئاگامەندانەیە بەرەو نەبووەکان. داهێنان ناڕازی بوون و نەویستی هەبوو دەستنیشان دەکات و بوونێکی نوێ لە نەبوونەوە پەلکێش دەکات. ئەم پرۆسەی داهێنان و گۆڕانکاریو نوێکردنەوەیە یاخیبوونە. یاخیبوون لە (هەبوو)و چیەتی نەگۆڕو بەسەردا سەپێنراوی بوون، لە بایەخە داهێنراوە کۆنەکان، لە ئایدیاو نەریتە نەویستراوەکان، کە پلەی بەمرۆڤ بوونی مرۆڤ نزم دەکەنەوەو مەحکومی دەکەن. لە یاخیبووندا مرۆڤ

دژی هەموو هێزێکی دەرەکی داگیرکەر ڕادەوەستێت و نایەوێ(مرۆڤ بوویی) خۆی بدۆڕێنیێ‌و ڕۆڵی مێژووی لەنێو بچێ. دیاریکردنی هەڵوێستی یاخی لەم بۆچوونەوە دوو شێوازی پێکەوە بەستراوی هەیە:

1- یاخیبوونی ئۆنتۆلۆجی.

2- یاخیبوونی مێژوویی.

شێوازی یەکەمی یاخیبوون ناوەڕۆکی بیروباوەڕی نێهێلیستی ئۆنتۆلۆجیە. ڕەتدانەوەی دەسەڵاتێکی ڕەهای لە ژوورو لە پێشترە بۆ بوون و مەبەست و بەهاکان. بەبێ یاخیبوونی ئۆنتۆلۆجی مسۆگەر کردنی دەسەڵاتی داهێنان و سەربەستی مرۆڤ نەگونجاوە. ئەگەر بوون مەبەست و بایەخ و واتای لەپێشتری بۆ دانرابێت مرۆڤ ناتوانێت بیانگۆڕێ‌و خۆی بەخاوەنی مێژوو بکات. لەم حاڵەتەدا بۆ سیستەمە مێتافیزیکیەکەی ئەریستۆ دەگەڕێینەوەو پەنای بۆ دەبەین. نەریتی زاڵبوی مێتافیزیکی ئەریستۆ دەسەڵاتی داهێنان و سەربەستی بۆ بوونێکی لەپێشترو بەرز دیاری دەکات و بە مرۆڤی نابەخشێ. ڕەتدانەوەی ئەو نەریتە گەڕانەوەی دەسەڵاتی داهێنان و سەربەستیە بۆ بوونی مرۆڤ. ئەم ڕەتدانەوەیە بنەڕەتی یاخیبوونە. یاخیبوون لە نەریتێکی زاڵبو، هەروەها لە بوونی دەسەڵاتێکی لەپێشتر، کە سەربەستی مرۆڤ سنوردار دەکات. ئەمەش لە خۆیدا ڕەتدانەوەیەکی ئۆنتۆلۆجیانەی نەریتێکی ئۆنتۆلۆجیەو یاخیبوونە لە بوونێکی ڕەها یان لە بیرۆکەی

بوونی ئەو بوونە. لە جیاکردنەوەی بوونی ڕەهاو بیرۆکەی بوونی ئەو بوونەدا دوو لایەنی یاخیبوونی ئۆنتۆلۆجی دەخەینە ڕوو؛ لە لایەکەوە ڕەتدانەوەی ئۆنتۆلۆجی دەسەڵاتی ئەو بوونەیە سەربەستی مرۆڤ سنوردار دەکات. لەم یاخیبوونەدا یاخیبوو نەبوونی ئەو بوونە ناسەلمێنێ بەڵکو ڕەتی دەداتەوەو خۆی بە ژێر دەستەی دەسەڵاتەکەی ناکات. نموونەی ئەم جۆرە یاخیبوونەش لە هەڵوێستی (ئیبلیس) لە میتافۆری ئایینی سامیەکاندا بە زەقی دیارەو سارتەریش لە شانۆگەرییەکەیدا *The Flies* ئاماژەی بۆ ئەم جۆرە یاخیبوون و بێباوەڕگەرییە کردووە.[106] لەسەرو ئەمانەشەوە بانگەشەی بێباوەڕگەرییەکەی نیتشەیە، کە دەڵێت (خوا مردووە.)[107] لە لایەکی دیکەوە ڕەتدانەوەی ئۆنتۆلۆجی نەریتی ئەریستۆ خۆی لەسەر سەلماندنی نەزۆکیو پوچەڵ کردنەوەی باوەڕگەری ڕادەگرێو هەوڵی بەدرۆ خستنەوەی بیرۆکەی بوونی دەسەڵاتێکی ڕەها دەداتەوە. یاخیبوون لەم لایەنەوە پێویستی بە بەڵگەی لۆجیکمەندانەی نادروستی ئەو بیرۆکەیە هەیە. کاتێك نیتشە پەنا بۆ بێباوەڕگەری دەبات، هەوڵی نەداوە لۆجیکمەندانە نەبوونی بوونی ڕەها بسەلمێنێت. لەو بۆچوونەوە، کە سوپەرمان لەگەڵ ڕەتدانەوەی ئەو دەسەڵاتەدا لە دایك دەبێت، باوەڕگەری هەڵنابژێرێت. بۆ سارتەریش

---

[106] - Jean-Paul Sartre, *The Flies,* translated by Stuart Gilbert, London: Hamish Hamilton, 1978. P. 75

[107] - Friedrich Nietzsche, Op. cit., P. 276

بێباوەڕی پێشمەرجێکی لۆجیکمەندانەی سەربەستی مرۆڤە. کەسێك باوەڕ بە بوونی خوا بکات ناتوانێ خۆی بە مرۆڤێکی سەربەست دابنێت. مرۆڤ لەسەر دووڕێیانی باوەڕگەریو بێباوەڕگەری ڕاوەستاوە. هەڵبژاردنی هەر یەکێك لەم ڕێگایانە چۆنیەتی بوون و واتای بوون لە ناوخۆیاندا گەڵاڵە دەکەن و گۆڕانکاری بنەڕەتی لەبووندا پەیدا دەکەن. ئەو هەڵبژاردنە مرۆڤ دەکات بە خاوەنی خۆی یان بەکۆیلە، سوپەرمان یان کەسێکی نارەسەن و داگیرکراو. لە ڕوانگەێ باوەڕگەرییەوە لافی سوپەرمانێتی لێنادرێت، بەڵام ئاڵای یاخیبوون هەڵدەکرێ. لە بەر ئەمەش لە توێژینەوەکەماندا ئۆنتۆلۆجی نیهێلێستی بوە بە بناخەیەکی پێویست بۆ مسۆگەر کردنی سەربەستی. چونکە ئۆنتۆلۆجی نیهێلێستی دەسەڵاتێکی لە پێشتر ناکات بە پێشڕەوی کاروانەکەیو هەڕەشەکەر بۆ دەسەڵاتی مرۆڤ. بۆ نموونە دۆستۆیەڤسکی لە ڕۆمانی *The Devils* دەسەڵاتی (بوونی ڕەها)بە ترس و (سەربەستی)یش بە خۆ ڕزگارکردن لەو ترسە دادەنێت.[108] خۆ ڕزگارکردنیش لەو ترسە لە ڕەتدانەوەی بوونە ڕەهاکەو یاخیبوون لە دەسەڵاتەکەیەوە دەست پێدەکات.

* بیر لەوە بکەوە، بەردێك بەقەد خانویەك بە ئاسمانەوە هەڵواسراوەو تۆ لە ژێریدا وەستاویت؛ ئەگەر بەسەرتا بکەوێ هەست بە ئازار دەکەیت؟

---

108- ڕۆمانی *The Devils* بۆ یەکەم جار بەناوی *The Possessed* بە ئینگلیزی بڵاوکرایەوە. لە ساڵی 1953 دەیڤد مارگارشاك، کە گۆڕییە سەر زمانی ئینگلیزی بەناوی(*The Devils* )ەوە لەچاپیدا.

- بەردێك بەقەدەر ئەم خانوە؟! بێگومان دەترسم.

* من باسی ترس ناکەم. ئایا ئازارت دەگا یان نا؟

- بەردێك بەقەدەر چیایەك ملیۆن پاوەن گرانە؛ بێگومان هەست بە ئازار ناکەم.

* بەڵام لە ژێریا بۆ ماوەیەك ڕاوەستی دەترسیت. هەموکەسێ دەترسێ. تەنانەت زانایەکی بلیمەت و دکتۆرێکیش دەترسێ. هەموو دەزانن کەوتنەکەی بە سەرتا بێ ئازارە، کەچی هەموو لەوە دەترسن، کە ئازاری هەبێ.

- ئەی هۆکاری دیکەی ترس چیە؟

* ڕۆژی دوایی.

- مەبەستت ئەشکەنجەی ژیانی پاش مردنە؟

*ڕۆژی دوایی، ڕۆژی دوایییە.

- ئایا کەس هەیە باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێت؟

* تۆ لە بۆچوونی خۆتەوە دەڕوانیتە کێشەکە. سەربەستی لەوێدایە جیاوزی لەنێوان ژیان و مردندا نەمێنێ. ئەوەی بەسەر ئازارو ترسدا سەرکەوێ دەبێت بەخوا.

- مەبەستت ئەوەیە، کە خوا هەیە.

* نیە، بەڵام هەیە. ئازار لە ناو بەردەکەدا نیە لەناو ترسەکەدایە لە بەردەکە. کەسێك بەسەر ئەو ترسەدا زاڵبوو دەبێ بە خوا. ژیانێکی نوێ

دادەهێنێ دەبێت بە مرۆڤێکی نوێ. مێژووی دەبێت بە جەنگاوەری بەرەو لە ناوبردنی بوونی خواو لەوێشەوە بەرەو جەنگاوەری. مرۆڤ جێگای خوا دەگرێو خۆی جیهان دەگۆڕێ.[109]

دەبینین جەنگاوەریو داهێنانی مێژوو سەرەنجامی ڕەتدانەوەی ئۆنتۆلۆجیە و بووە بە ناوەڕۆکی دەقی پڕۆژە فەلسەفیەکەمان و بوونی مرۆڤیش لەسەر زەمینەیەکی نیهێلیستی ڕادەگرێ و قورسایی گۆڕانکارییەکان و لێپرسینەوەکانی دەخاتە ئەستۆیو میدالیای جەنگاوەری بە بەرۆکیدا دەکات. یاخیبوونی ئۆنتۆلۆجی، لێرەدا بە کەڵە مەرجێکی هەڵوێستی ڕەتدانەوەمان داناوە پەیوەندییەکی پێویستی بە یاخیبوونی مێژووییەوە هەیە. هەرچەندە ئەم یاخیبوونە ڕەتدانەوەی بوونێکی لەمێژوو بەدەرە، بەڵام کارتێکردنی ڕادیکاڵانە بەسەر مێژووەوە دەخاتەگەڕو جەنگاوەرانە مرۆڤ بە داهێنەری گۆڕانکارییەکان دادەنێت. مرۆڤی یاخیبوو لە ڕەتدانەوەی دەسەڵاتی ڕەهای مێژوو بەدەردا بەسەر(چاوەڕوانی)یدا زاڵدەبێو ڕوو لە ئاسمان و پاڕانەوە بۆ هاتنی(گۆدۆ) ناکات. ئەو دەزانێ چاوەڕوانیو پاڕانەوە لە ئاستی هێزێکی دەرەکیدا بێدەسەڵاتی خۆ دەسەلمێنێو لە هەمانکاتیشدا نکۆڵی کردن لە بوونی ئاگامەندانەو داهێنەرانەی خۆیە. ئەمەش لە ئەنجامدا

---

[109]- Fyodor Dostoyevsy. *The Devils,* translated by David Magarshack, New York: Penguin Books, 1975. PP. 125-6.

هۆکاری سەرهەڵدانی بارودۆخی نەرێیی نامۆیی یان درۆ لەگەڵ خۆ کردنە .[110] یاخیبوونی مێژوویی تەواوکەری یاخیبوونی ئۆنتۆلۆجیە. ڕەتدانەوەی دەسەڵاتی داگیرکەری مێژوویی‌یە، کە خۆی لە ناوەندی چەوساندنەوەی ڕامیاریو ئابووریو کۆمەڵایەتیدا دەردەخات. یاخیبوون لەداگیرکردنی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤێکی دیکەوەو بە نامرۆڤکردنی مرۆڤ بە دەستی مرۆڤێکی دیکە. ئەگەر ئاوڕ لە مێژووی بیروباوەڕی فەلسەفی بدەینەوە دەبینین هیگڵ یەکەم بیریارە لەسەر زەمینەیەکی فەلسەفیانە هەوڵیداوە هۆکارو چارەسەری داگیرکردنی مێژوویی باسبکات. پاش ئەم بیریارەش مارکس بە نیازی ڕەتکردنی کەموکورتیەکانی ناو بۆچوونەکەی هیگڵ لێکدانەوەیەکی پێشکەوتنخوازانەتری خستۆتە بەردەممان. جیاوازی نێوان بۆچوونەکانی هیگڵ و مارکس سەبارەت بە داگیرکردن و یاخیبوونی مێژوویی لە چەند خاڵێکدا کۆدەبنەوە: هەرچەندە هیگڵ و مارکس پەیڕەوی لۆجیکی دیالێکتیك دەکەن بەڵام بناخە مێتافیزیکیەکەیان بۆ گۆڕانکارییە دیالێکتیکیەکان لە یەکدیەوە جیاوازن. بۆ هیگڵ جوڵانی دیالێکتیکی تەوژمی ژوورکێشی بیرۆکەکان یان کاتیگۆرییەکانەو مارکسیش

---

[110]- (لە چاوەڕوانی گۆدۆدا) ناوی شانۆگەرییەکی (سامۆئیل بیکیت)ە (1906-1989). بۆ یەکەمجار، ئەم شانۆگەرییە لە ساڵی 1953خرایە سەر شانۆ. گۆدۆ پاڵەوانێکی نادیارو چاوەڕوان لێکراوە تاکو ژیانی چاوەڕوانکەران بگۆڕێت. لە کۆتاییدا گۆدۆ منداڵێك ڕادەسپێرێ بە چاوەڕوانکەران بڵێت، کە ئەو نایەت. مەبەستیش لەم کۆتاییە لەوێدایە، کە پێویستە مرۆڤ خۆی ژیانی خۆی بگۆڕێ.

سەرچاوەی تەوژمەکە بۆ ئەستوو جوڵانی ئەستو دەگەڕێنێتەوە. هۆکاری سەرهەڵدانی زۆرانبازی ناو مێژووی نێوان لایەنە ناکۆکەکان بە بیروڕای هیگڵ بۆ مسۆگەر کردنی (بڕوانامە)یە. بۆ ئەوەی لایەنە ناکۆکەکان بڕوانامەکە پەیدا بکەن، هەر یەکێك لەوان بۆ ئەو مەبەستە زۆر لە لایەنەکەی دیکە دەکات بڕوا بە دەسەڵات و سەربەستیەکەی بهێنیٚ. مسۆگەر کردنی بڕوانامەش، وەکو لە مێژوودا بینراوە پێویستی زۆرانبازیو ململانێی چەسپاندوە. لە بەر ئەوەی هەردوو لایەنە ناکۆکەکە داوای بڕوانامە لە یەکدی دەکەن دەبیٚ خۆیان بخەنە ناو جەنگێکی خوێناوییەوەو بەزۆر بڕوانامەکە لە لایەکەی دیکە وەرگرن.[111] لەم جەنگە خوێناویەدا یەکێك لە لایەنە جەنگاوەرەکان(ترس) لەمردن داگیری دەکات و لە بەرامبەر غەریزەی ژیان و مانەوەدا بەچۆکدا دیٚ و خۆی بەدەستەوە دەدات. بڕوا بەدەسەڵات و سەربەستی لایەنەکەی دیکە دەهێنیٚو دەسەڵات و سەربەستی خۆی دەدۆڕێنیٚ. لە ئەنجامدا دوو جۆر بوون پەیدا دەبێت: داگیرکەرو داگیرکراو یان هیگڵ گوتەنی: خاوەن کۆیلەو کۆیلە.[112] زۆرانبازی نێوان ئەم دوو لایەنە ناکۆکە، بۆ هیگڵ، بووە بەناوەڕۆکی گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو، کە لە کۆتایی تەوژمە ژوورکێشیە دیالێکتیکیەکەدا کۆیلە جارێکی دیکە دەبێتەوە بە خاوەنی

-[111] F. W. Hegel. *The Phenomenology of Mind,* P. 229

-[112] هەمان سەرچاوە. Ibid.

دەسەڵات و سەربەستیەکەی‌و دەستگای کۆیلایەتییەکەی لەنێو دەچێ‌و هەردوو لایەنە ناکۆکەکە بڕوانامە بەیەکدی دەبەخشن.

مارکس، لەم ڕوەوە، بۆ ڕوونکردنەوەی جیاوازی بیروباوەڕە فەلسەفیەکەی لە هیگڵەوە هۆکاری سەر هەڵدانی زۆرانبازی نێوان لایەنەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنداریەتی تایبەتی نەك بڕوانامە. لەبەر ئەوەی مارکس ئاوڕی لە لایەنی دەروونی مرۆڤیش نەداوەتەوە ئاماژەی بۆ (ترس) لەمردن نەکردووەو زاڵبوونی غەریزەی ژیانیش نەبووە بە کێشەیەکی بایەخدار لە بۆچوونە فەلسەفیەکەیدا. بۆ مارکس هۆکارەکانی گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو ئەستوییی‌و دەرەکین نەك ناوەکی‌و سایکۆلۆجیانە. لەگەڵ لابردنی هۆکارە دەرەکیەکانیشدا ، یان گۆڕانە ئەستوییەکاندا شێوازی پەیوەندی نێوان لایەنە ناکۆکەکانیش دەگۆڕێ‌و بگرە کۆمەڵ دەگاتە قۆناخێك، کە داگیرکردن بەتەواوی تیایدا لە ناو دەچێت.[113]

مادامەکی یاخیبوون ڕەتدانەوەی دەسەڵاتی داگیرکەرە، هەڵوێستی ڕادیکاڵانەی یاخیبوون مۆڵکی داگیرکراوە. یاخیبوون لەلای داگیرکەر، کە خۆی دەسەڵاتێکی داگیرکەرە بێ‌بناخەو لە لۆجیك بەدەرەو،

[113] - Karl Marx. *Economic and Philosophical Manuscript1844,* PP. 98-100.

وەکو(بازنەی چوارگۆشە) کێشەیەکی پارادۆکسە. لەم ڕووەوە یاخیبوون خاوەنی سێ لایەنی پێکەوە گرێدراوە: داگیرکراو، داگیرکەرو ڕەتدانەوە. بەبێ یەکێك لەم سێ لایەنە یاخیبوون پەیدا نابێت. هەروەها دەبینین ئەم سێ لایەنە لەبوونی داگیرکەردا کۆ نەبوونەتەوەو بوونێکی داگیرکراوی نیە تاکو دژایەتی لەگەڵ داگیرکەرەکەیدا بکات.

بوونی داگیرکراو بۆ داگیرکەر بووە بە (شت)یان کەلوپەل و داگیرکراو مافی بەکارهێنانی ئەو کەلوپەلەی بەخۆی داوە. ئەگەر بڕوانینە مێژووی ئەو سەدەمەی کۆیلایەتی تێیدا باو بووە، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، کە کۆیلە بە مرۆڤ یان بەکەس دانەنراوەو لە بازاڕا وەکو شمەك(کاڵا) فرۆشراوەو بەکار هاتووە. لەژێر ئەم بارودۆخە نەرێ و نامرۆڤکردنەدا، ئەگەر داگیرکراو لە ئاستی بە(شت) کردنی بوونیدا ڕازی بێت و بەتەواوی بێئاگا لە بوونی خۆی بژی کۆیلایەتی بە ڕوودانێکی پێویست و پۆزەتیڤ دادەنێت و بە نامۆیی دەمێنێتەوە. ئەمەش بە گوێرەی ویستی داگیرکەرە، چونکە ئەو دەیەوێت داگیرکراوەکە بە نامۆییو بێ- ئاگایی بهێڵێتەوە. لە کاتێکدا داگیرکراو هەڵوێستی ڕەتدانەوە هەڵبژێرێ و یاخی دەبێت، داگیرکەر لەترسی دۆڕانی ئەو جیهانەی بە داگیرکردن بۆ خۆی دامەزراندووە هەوڵی داگیرکردنێکی تەواوی لایەنە یاخیبووەکە دەدات و لەم زۆرانبازییەدا

داگیرکەر لەژێر کاریگەری فۆبیای(ترس)لە لەدەستدانی بەرژەوەندییەکانی، لایەنە جەنگاوەرەکەی بەرانبەری بەرێگەی بەکار هێنانی (زەبر)ی توندڕەوانە لەناو دەبات. ئەگەر خاوەن کۆیلە نەتوانێت جارێکی دیکە کۆیلە یاخیبووەکە داگیر بکاتەوە، زەبر بەرانبەری دەخاتە گەڕو دەیکوژی. ئەم کارە توندرۆییە لە پێناوی مسۆگەر کردنی بڕوانامەکەو بەرژەوەندییەکانی داگیرکەر دێتەکایەوەو ئەنجامێکی تراجیدی بە زۆرانبازییەکە دەدات. داگیرکەر وادەزانێت بە کوشتنی داگیرکراوەکە کێشەکە چارەسەر دەکات و بڕوانامەیەکی ڕەها بۆخۆی مسۆگەر دەکات. بە پێچەوانەی ئەمەوە کوشتنی داگیرکراو ناکۆکیەکە ئاڵۆزتر دەکات. ئەگەر لەسەرەتاوە سەرنجێکی وردی زۆرانبازییەکە بدەین، یەکەم، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت، داگیرکەر لە لایەن مرۆڤێکی دیکەوە بڕوانامەی پێنەدراوە. ئەو لایەنە داگیرکراوەکەی کردووە بە(شت). لە کاتی کوشتنی داگیرکراوە یاخیبووەکەشدا مسۆگەر کردنی بڕوانامەکە دەبێت بە گونجاوێکی هەمیشە نەگونجاو.

لەوەوپێش باسمانکرد، یاخیبوون هەڵوێستێکی ڕادیکاڵانەیە. ئایا مەبەستمان لەم پێناسەیە بۆ یاخیبوون چیە؟ ڕادیکاڵ چ واتایەکی هەیە؟ مەبەست لە هەڵوێستی(ڕادیکاڵ)گۆڕانکارییە بنەڕەتیەکانە ئەو هەڵوێستە لە بووندا دایدەهێنێ. ئەگەر یاخیبوون خسڵەتی گۆڕانکاری

بنەڕەتی نەبوو، بە ڕادیکاڵ دانانرێت. ئەگەر کۆیلەیەك لەسەر زیادکردنی خواردنی ڕۆژانەی لە خاوەنەکەی یاخی بێت، هەڵوێستەکە بە ڕادیکاڵانە خۆی دەرناخات، چونکە ئەو جۆرە یاخیبوونە گۆڕانکاری بنەڕەتی لە بوونی ئەودا دروست ناکات. ئەگەر کۆیلە ڕۆژی سێجار یان جارێك خواردنی پێبدرێ هێشتا کۆیلەیەو بوونیشی داگیرکراوە. یاخیبوون لە بنەڕەتەوە بوونی داگیرکراو دەگۆڕێو دەیکاتەوە بە مرۆڤ. گۆڕانکارییەکان لە نامۆیی‌یەوە بۆ خۆ-ناسینەوەو ڕەسەنیەتی بوونەوەو لە بە نا-مرۆڤکردنەوە بەرەو بە مرۆڤبوونەوە مل دەنێ. بوونی داگیرکراو لە شتەوە دەبێتەوە بە بوونێکی ئاگامەندانەو داهێنەرو سەربەست. ئەمەش گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی (ئۆنتۆلۆجی)و مێژووییە لە بوونی داگیرکراوە یاخیبووەکەدا. یاخیبوون خۆ ناسینەوەو گەڕانەوەیە بۆ ڕەسەنیەتی بوون. ناسینەوەی (خۆ)یە، وەکو بوونێکی ناتەواو و داهێنەر، کە سەربەستانە بەرەو تەواوکۆیی ڕەوتدەکات و ناوەڕۆکی خۆی دادەهێنێ.

یاخیبوون لە هەر دوو شێوازەکەیدا هەڵوێستی ڕەتدانەوەیە لە چەمکی (نا)دا خۆی دەردەبڕێ. ئەم چەمکە بە پێچەوانەی (بەڵێ)وە ئاماژە بۆ دەسەلاتی ڕەتدانەوە دەکات. چەمکێکە واتای بوون لە بنەڕەتەوە دەگۆڕێو لەسەر زەمینەیەکی نوێتر ڕەنگی بناخەکەی دەڕێژێ. دەرنەبڕین و کەمکردنەوەی ڕۆڵی چەمکی (نا)لە ژیانی

داگیرکراودا هۆکارە بۆ لە ناوبردنی تەوژمی ژوورکێشیەکەی مێژوو. لە هەمان کاتیشدا(نا)، کە یاخیبوونە لە(بەڵێ)ی دامەزرێنراوو نەویست و دەسەڵاتێکی ڕووخێنەری لە ناو خۆیدا حەشارداوە، خاوەنی(بەڵێ)یەکی نوێی ویستراوە. هەموو (نا)یەك (بەڵێ)یەو هەموو هەموو هەڵوێستێکی ڕەتدانەوەو ڕوخێنەر دامەزراندنی داکەوتێکی نوێ‌و ویستراوە، کە بوونی یاخیبووەکەی لێ بێبەش کراوە. یاخیبوون پەیوەندییەکی پێویستی بە داکەوتی بوونەوە هەیە. یاخیبوون لە پێناوی یاخیبووندا فەنتازیایە، چونکە بەبێ ڕەتدانەوەی داکەوتێکی(هەبوو)و داهێنانی داکەوتێکی(نەبوو) بیر لە یاخیبوون ناکرێتەوە. داکەوتی(هەبوو)و(نەبوو) مرۆڤانەیەو بەستراوە بە بوونەوەو لە دەرەوەی بووندا نیە. ڕوخاندن و داهێنان لە پێناوی بووندایەو هیچ شتێك ژوور بوون ناکەوێت و مرۆڤ تێپەڕ ناکات. مرۆڤ دەبێ بە مرۆڤی بمێنێتەوەو هەوڵبدات بوونی خۆی نەدۆڕێنێ. بە نامرۆڤکردنی مرۆڤ، چ لە ڕووی داگیرکردن و بە(شت)کردنی ئەم بوونەو چ لە ڕووی تێپەڕبوونی بەسەر ئەم بوونەدا، (بەو شێوەیە نیتشە بۆی دەچێت،) بە نامۆکردنی ئەم بوونەیە. مرۆڤ نە دەبێ بکرێتە کەل و پەل و نەبە خوا، ئەو مرۆڤەو نابێت لە مرۆڤایەتی داماڵرێت. گەورەیی مرۆڤ لەوێدایە بوونی خۆی بسەلمێنێت و نەك هەوڵ بدات خۆی بە بوونێکی دیکە بێجگە لەخۆی بگەیەنێت. ئەگەر مرۆڤ بە شێوەی پاڵەوانی ڕۆمانەکەی دۆستۆیەڤسکی، لە بەر ئەوەی

خوا نیە خۆی بکات بە خوا، بڕیار لەسەر بە نامرۆڤکردن و نامۆیی بوونی خۆی دەدات.[114] لەوەو پێش باسمانکرد بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤ بە شێوەیەك ئەم بوونە دەردەخات، کە خۆی واتا بەبوونی خۆی بدات و هەوڵی خۆ تەواوکردن بدات. هەوڵدانەکەی بەخۆ- بوون و داهێنانی ناوەڕۆکیەتی. ئەمەش جێگاو دەسەڵاتێکی تایبەتمەند بۆ بوونی دیاری دەکات و لە هەبووەکانی جیادەکاتەوە. لە بەرئەمە تێکۆشانی مرۆڤ لە داهێنانی مێژوودا بە (خوا) گەیشتن نیە، بەڵکو بە مرۆڤ بوونە. ئەم بۆچوونەمان لەگەڵ دوگمای بڕواگەریو بێبڕواگەرانەی نیتشە ناکۆك ڕادەوەستێ. مەبەست لە دۆگمای بڕواگەریش ئەو بیروڕا سۆفیگەریانەیەگەیشتن بە خواو یەکبوون لەگەڵیدا بەدوا پلەی ئامانج و هەوڵدانی گیانەکی دادەنێن. جیاوازی نێوان بیروڕای ئەم سۆفیانەو نیتشە لەوێدا یەکدەگرن، کە هەردوو لایان مرۆڤ نامۆ دەکەن و دەیکەن بە بوونێکی دیکە. بەڵام بۆ نیتشە گەیشتن بەو پلەیە لە ڕەتدانەوەی ئەو بوونە ڕەهایەدایەو سۆفیەکانیش پەنا بۆ توانەوەی بوونی مرۆڤ لەناو ئەو بوونەدا دەبەن.[115]

[114]- مەبەستم لە(کریلۆڤ)ە پاڵەوانی ڕۆمانی *The Devils*. ئەو سیستەمە ئۆنتۆلۆجیەی پەیڕەویمانکردووە ڕێگە نادات مرۆڤ لە پلەی بوونی خۆی دابەزێ خۆی لە ئاستی بوونێکی دیکەدا بە کەمتر دابنێ و هەوڵبدات خۆی بەو بوونە بگەیەنێت. هەروەها نیتشە بانگەشەی تێپەڕبوون بەسەر مرۆڤدا دەکات و داوا دەکات مرۆڤ خۆی ڕەتکات. بڕوانە:
Friedrich Nietzsche. Op. Cit., P. 276

[115]-جارێکی دیکە ئاماژەی ئەو خاڵە دەکەم، کە هەموو سۆفیەکان پەیڕەوی ئەم دۆگمایە ناکەن.

یاخیبوون پردی پەیوەندی لە نێوان بوون و بەهادا هەڵدەبەستێ. پێش هەموو شتێك بەها بۆ یاخیبوون لە یاخیبووندایە. یاخیبوون ڕەتدانەوەی دامەزراندنە. بایەخیش لە یاخیبووندا بڕیاردانە بەسەر چاکەو خراپەی داکەوتی (هەبوو)و(نەبوو)دا، کە خۆی بەسەر یاخیبووندا دەسەپێنێ. مرۆڤی یاخیبوو لە هەڵوێستە ڕەتدانەوەکەیدا بەها دامەزرێنراوەکان دڕوخێنێو بەهای نوێ دادەهێنێ. بێ بەهایی یاخیبوون لە ڕەتدانەوەو ڕوخاندنی بەها دامەزرێنراوەکاندایەو بایەخداری ئەم هەڵوێستەش لە داهێنانی بەهای نوێدایە. لەبەر ئەم هۆکارە بەهای داهێنراوی یاخیبوون هەمەکیو بەرز نیەو لە سەرچاوەیەکی دەرەکیەوە نەکراوە بە بەری بووندو هەڵقولاوی بیرو هەستی ڕەتدانەوەی یاخیبووە. بەهایەکە لە ناو پرۆسەی گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوودا پەیوەندی بەکات و شوێنی خۆیەوە هەیەو ئەویش لە ناو تەوژمە ژوورکێشیەکەدا خۆی ڕاناگرێو بە بەردەوامی نامێنێتەوە. خسڵەتی گۆڕین لێرەدا بەستراوە بە دینامیکیەتی بوون و هەڵوێستی ڕەتدانەوەی ئەم بوونەوە، کە وەکو هەبووەکان ستاتیك نیەو بەرەو تەواوکۆیی دەڕوا. بەردەوامی گۆڕانکاری لە بووندا بەردەوامی یاخیبوون و گۆڕانکاری بایەخەکانە. بایەخی هەمەکیو بەرزو دەرەکی دژی ئەم بۆچوونە ئۆنتۆلۆجیە ڕادەوەستێو لەگەڵیدا ناکۆکە. دامەزراندنی بایەخی هەمەکیو بەرز پێویستی بە سیستەمێکی ئۆنتۆلۆجی جیاوازتر هەیە

لەسەرو دەسەڵاتی مرۆڤەوە سەرچاوەیەکی پڕو نەگۆڕ لە دەرەوەی مێژوودا بۆ بایەخەکان دیاری بکات.

یاخیبوو تێگەیشتنی خۆی لە بوون هەیەو ناتوانێت لە بوون نا- ئاگاو نامۆ بێت و خۆی واتاو بەها بە بوون دەبەخشێ. لە بەرئەمە یاخیبوون سەرهەڵدانی هەڵوێستی ڕەوشتیانەیە بۆ بوون و یاخیبووش مرۆڤێکی خاوەن ڕەوشتە، کە دژی ڕەوشت ڕادەوەستێ. لە ڕەتدانەوەی بەها دامەزراوەکاندا خۆی بە نارەوشت دادەنێو لە دامەزراندنی بەهای نوێدا دەبێت بە داهێنەری ڕەوشت و لێپرسراو لە ئاستی هەڵبژاردنەکەیدا. بێگومان مێژووی مرۆڤایەتی زنجیرەیەکی نەپچڕاوی یاخیبوونە، لە هەموو سەدەمێکدا داگیرکردنی مرۆڤ بۆتە هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی یاخیبوون. بەڵام لەسەرو هەموویانەوە، نیتشە گوتەنی، دەتوانین سەدەمی ئەمڕۆمان بە سەدەمی بەهاکان دابنێین.[116] ئەم باوەڕەی نیتشە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی ڕەتدانەوەی سەدەم بەرانبەر هەموو دەسەڵاتە داگیرکەرەکان لە ناو مێژووی بیرو شارستانیەتدا. مێژوو خۆی گەیاندۆتە سەرەتای قۆناخێك مرۆڤ بە ئاگاوە لە واتای بوونی خۆی دەکۆڵێتەوەو دەیەوێت سەربەستانە پرۆژەکانی بوونی بە ئەنجام بگەیەنێت و بەها و واتای مرۆڤایەتی دەستگیر بکات و مێژوو بگۆڕێ.

---

[116]- Friedrich Nietzsche. Op. Cit., P. 313

بەشی حەوتەم

# سەرەنجام

بڕیاردان لەمەڕ نوسینی سەرەنجامێك بۆ پڕۆژەیەکی فەلسەفی لە دەستپێکردنی پڕۆژەکە دژوارترە. لە ئاستی ئەو پرسیارانەدا ڕاماندەگرێت؛ ئایا توانیومانە بە کۆتایی گەشتەکەمان بگەین؟ یان ئەم سەرەنجامە سەرەتایەکی نوێیە بۆ قۆناخێکی دیکەو بیرکردنەوە لە جولانی بەرەوپێشچوونی خۆی ناکەوێت؟ ئەگەر ئێمە بمانەوێ پۆزەتیڤانە وەلامی پرسیاری یەکەم بدەینەوە، ئەوا خۆمان توشی دۆگمایەکی چەقیو دەکەین و باوەڕ بە داهاتووی بیرکردنەوە ناکەین. ئەمەش لەگەڵ ناوەڕۆکی بیرکردنەوە فەلسەفیەکەماندا ناکۆکە. فەلسەفە هەڵقوڵاوی بیری مرۆڤەو لە گۆڕانکارییەکی بەردەوام دایە. ئەوەی بەدوا هەنگاو لە قۆناخێکدا دادەنرێت، دەبێت بەسەرەتا بۆ قۆناخێکی دیکە. لەگەڵ ئەمشدا حەز دەکەم بەو نیازەی ڕۆشنایی زۆرتر بخەمە سەر ئەم پڕۆژەیە سەرەنجامێك ئامادە بکەم.

گرینگی ئەم پرۆژە فەلسەفیە لەوێدا دەردەکەوێت، کە لە سەرەتاوە لە نەریتی زاڵبوی ئەریستۆ یاخی دەبێت و لەوێوە بە شوێن واتای بووندا دەگەرێت. ئەمەش خسڵەتێکی تایبەتمەندی بە بیرکردنەوەی فەلسەفی پرۆژەکە داوەو لەسەر زەمینێکی رادیکاڵ بناخەکانی دامەزراندووە. بەم شێوەیە توێژینەوەکەمان لەمەر واتای بوون بووە بە توێژینەوەیەکی "بونخوازی رەتدانەوە". لە لایەکەوە رەتدانەوەی سیستەمی مێتافیزیکی ئەریستۆو لە لایەکی دیکەوە رەتدانەوەی بۆچوونە فەلسەفیەکانە، کە لەدەرەوەی بوونی مرۆڤەوە، بەبێ ئەوەی تایبەتمەندی ئەم بوونە ببینن لە واتاکەی دەکۆڵنەوە. لەگەڵ رەتدانەوەی سیستەمی مێتافیزیکی ئەریستۆدا گەیشتینە ئەو باوەرەی بوون لەسەر بناخەیەکی هۆشەکیو مەبەست پێدراو دانەمەزراوەو بەڵکو بوون لە مەبەست و بنەرەت بەدەرەو خۆی بناخەی خۆیەتی. گەیشتن بەم باوەرەش لەسەر ئەو بەڵگانە راوەستاوە بەدرێژی باسمانکردوون. لێرەشەوە لەسەر ئەو باوەرەی بوون لە بنەرەت بەدەرەو بێمەبەستە خۆمان گەیاندە سیستەمێکی مێتافیزیکی نوێ بەناوی ئۆنتۆلۆجی نیهێلستی بۆ توێژینەوەکەمان. پاش رەتدانەوەی مێتافیزیکی ئەریستۆ، نەریتی دێکارتیش، وەکو پاشماوەی نەریتی ئەریستۆ، رەتدرایەوەو لێکۆڵینەوەیەکی نوێمان بۆ بوونی مرۆڤ دامەزراندو هەوڵماندا لە ناوەوە نەك لە دەرەوەی ئەم بوونەوە لە واتاو خسڵەتەکانی بگەین.

هەروەها گرنگیەکی دیکەی پرۆژەکەمان لە هەڵبەستنی پردی پەیوەندی نێوان بوون و مێژوودایە. ئەم پەیوەندییە بەستراوە بە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونەوە، کە بوون بە خۆیەکی ئاگامەندو بێ ناوەڕۆك دادەنێ. ئەمەش دینامیکیەت بەبوون دەدات و ناتەواوی تێدا دەبێت بە هاندەر بۆ سەرهەڵدانی تەوژمێکی ژوورکێشی بەرەو تەواوکۆیی. تەوژمی ژوورکێشی ئەم بوونە بە تەنیا لە ڕوودانی گۆڕانکارییەکانی چوار کاتیگۆری لۆجیکی ئەریستۆدا نیە. گۆڕانێکی ناوەڕۆکیشە لەناو بوونداو بەسەر بووندا دێت بوون بەرەو قۆناخێکی پێشکەوتووتر دەبات. ئێمە لەو پێگەیەوە بەو ئاکامە گەیشتین، کە بوونی بە ناتەواو داناو بونیادی ئۆنتۆلۆجیەکەی لە بونیادی (هەبوو)ەکان جیاکردەوە.

بوون بێ‌مەبەست و لەواتا بەدەرو ناتەواوە. نەبوونی و ناتەواوی (پێویستی)خۆ تەواوکردنی بەسەردا دەسەپێنن و دەیکەن بە داهێنەری ناوەڕۆکی. لەم ڕووەوە، ناوەڕۆك دەستەیەك خسڵەتی نەگۆڕو لە پێشتر دراو نیە، پرۆژە هەڵبژێرراوو دامەزرێنراوەکانی بوونە، لە تەوژمە ژوورکێشیەکەدا ڕۆژانە بڕیاریان لەسەر دەدرێت و بە ئەنجام دەگەینرێن. ئەگەر بوون خاوەنی ناوەڕۆکێکی لەپێشترو نەگۆڕ بوایەو ئەو ناوەڕۆکەی بەسەردا بسەپێنرایە لە لایەکەوە نەیدەتوانی گۆڕانکارییان بەسەردا بهێنێ‌و

لە لایەکی دیکەشەوە دەسەڵاتی داهێنانی نەدەبوو. ئەمەش دەبێتە هۆکاری دابڕانی بوون لە مێژووەوەو لە هەمانکاتیشدا بە نامۆکردنی بوون. بوونێك دەسەڵاتی داهێنانی ناوەڕۆکی خۆی بدۆڕێنێ ناتوانێ ببێت بەوەی خۆی دەیەوێ‌و نا- ڕەسەن دەبێت. داهێنان، لەم توێژینەوەدا بووە بە پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی و بوون و مێژوو پێکەوە گرێدەدات. بەبێ داهێنان مێژوو پەیدا نابێت، لەبەر ئەوەی تەوژمە ژوورکێشیەکەی بوون نەبڕاوەیە، مێژووش، لەم بۆچوونەوە، دەبێت بە ڕەوتێکی داهێنراوی لە کۆتایی بەدەرو بەردەوام.

بوونی مرۆڤ ئاگامەندانەیە. ئاگامەندی ناوەڕۆکی گیانەکی دێکارت و خۆی هەمەکی فیختەو *Geist*ی هیگڵ نیە. بوونێکی هەندەکی‌و ناتەواوە. شتێکە هەمیشە هەیەو نیە. ئەم دوو لایەنە تایبەتمەندی بە ئاگامەندی دەبەخشن و لە هەبووەکانی جیادەکەنەوە. شتێکی هەبوو خاوەنی نەبوو نیە. هەبووەکان پڕو تەواون و ناوەڕۆکێکی نەگۆڕیان هەیە. ئاگامەندی بە پێچەوانەی هەبووەکانەوە(نەبوون)ی لە ناو خۆیدا شاردۆتەوە. ناسینی ئاگامەندی بەم شێوەیە ڕەتدانەوەی بیردۆزە دوانەکیەکەی دێکارتە، کە ئاگامەندی بە ناوەڕۆکێکی نەگۆڕو پڕو گیانەکی دادەنێت و لە ئەستوی دادەبڕێ. لەگەڵ ئەمەشدا ساکارانەو بە سەرزاری هەڵسوکەوتمان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا نەکردووە. بەبێ

خۆشکردنی زەمینێکی نوێی ئۆنتۆلۆجی بە هەڵگێڕانەوەی کۆجیتۆو ڕەتدانەوەی بیردۆزی دێکارتی ڕازی نەبووین. کۆجیتۆکەی دێکارت بناخەی مێتافیزیکی خۆی هەیە پێویستە ئەو بناخەیە هەڵبوەشێنرێتەوەو ئەمەش دوابەدوای خۆی داوای زمانێکی نوێی فەلسەفیمان لێدەکات، تاکو بوونی ئاگامەند نەخرێتە بەر ڕۆشنایی ئەو کاتیگۆریانەوە، کە هەبووەکانی پێدەناسرێن. پاش هەڵوەشاندنەوەی بناخەی مێتافیزیکی دێکارتی، وەکو پاشماوەو بەردەوامی مێتافیزیکی ئەریستۆ بە ڕاکشاوی کۆجیتۆکەمان هەڵگێرایەوەو لێکدانەوەیەکی نوێمان بۆ ئاگامەندی هێنایەکایەوە. لێکدانەوەیەك، ئاگامەندی خۆی لە ناوەوەی خۆیەوە بۆ بوونی خۆی پەیدای دەکات.

(نەبوون)ی بوونی ئاگامەندیمان بە دوو شێواز ڕوونکردەوە: لە لایەکەوە، بوونی ئاگامەندی ناتەواوەو بەم ناتەواویەوە پەیدا بووە. لە لایەکی دیکەوە بوونێکە بەرەو(نەبوون) یان مردن. ڕەوتی ئەم بوونە لە نەبوونەوە بەرەو نەبوون یان بەرەو نەمان ئاکامی ئەو شێوە ئۆنتۆلۆجیەیە لە توێژینەوەکەماندا بۆ ئەم بوونەمان دامانمەزراندو پەیڕەویمان کردوە. لە بەر ئەم هۆکارەش زانستیانە لەواتای بەرەو مردن تێنەگەیشتوین و هەوڵماندا فەلسەفیانە لە واتاکەی بکۆڵینەوە. لەم بۆچوونە فەلسەفیەمانەوە گەیشتینە ئەو باوەڕەی مردن لە پەیوەندییەکەیدا بە

بوونەوە پێویستی داهێنانی پرۆژەکانی هێناوەتە پێش. ئاگایی ئاگامەندی لەمردن (کات)یەتی ئەم بوونە دەردەخات. ئاگامەندی بە ناتەواوی‌و تەمەن کورتیەوە ڕوو لە مردن دەکات. (کات)ی مردنیش نادیارە. لەو ساتەوە ئاگامەندی ڕسکاوە مردن هەڕەشە لە بوونی دەکات و لە هەموو شتێك زیاتر لێوەی نزیکەو ڕێگەی نادات بوونی خۆی تەواو بکات، بەڵام ئاگامەندی بێوچان هەوڵدەدات پێش ئەوەی بە مردن بگات پرۆژەکانی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت. ئەگەر مردن پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی ئاگامەندی نەبووایە(داهێنان)نەدەبوو بە پێویستی و مێژووش بە جۆرێکی دیکە دەبینراو واتاکەی لێکدەدرایەوە.

بیرکردنەوەی نیهێڵیستانەمان تاکو سەر نێگەتیڤانە نیە. بۆ ئەوەی فەلسەفەکەمان بە تەنیا ڕۆخینەر نەبێت، پێویستە خۆمان بە دوورگەیەکی پاش نیهێڵیزم و پۆزەتیڤانە بگەیەنین. بێگومان ئەمەش لەناو بیرکردنەوە نیهێڵیستەکەدا دەژی و سەر هەڵدەدات، چونکە ڕەتدانەوەی داکەوتێکی نەویست دامەزراندنی داکەوتێکی ویستراوە. ڕەتدانەوە، کە دەسەڵاتی داهێنانی ئاگامەندی لەناو خۆیدا هەڵیگرتووە، سەربەستانە بۆ دامەزراندنی ناوەڕۆك و بایەخەکان و واتای بوون بەکاردێت. لەم ڕووەوە، لە ڕووخاندن و دامەزراندا ئاگامەندی خۆی دەکات بە بوونێکی مێژوویی‌و ناوەرۆکی دادەهێنێ.

ڕوخاندن و دامەزراندن، لە هەمانکاتدا واتایەکی نوێی بە بوونی ئاگامەندی بەخشیوە، ئەویش (یاخیبوون)ە. ئاگامەندی لە دیاریکردنی هەڵوێستی نیهێڵیستیداو ڕوخاندنی داکەوتی نەویستدا بەبەردەوامی یاخی دەبێت. ئاگامەندی لە یاخیبووندا بەهاکان دادەهێنێ‌و بڕیار لەسەر هەڵبژاردنیان دەدات. لێرەدا ڕەوشت بۆ ئاگامەندی یاخیبوونە لە داکەوتی نەویست و دامەزراندنی داکەوتێکی ویستراو. ڕەوشت لەم ڕووەوە بێ ڕەوشتییەو بێ‌ڕەوشتیش ڕەوشتە. بەها بێ بەهایی‌و بێ بەهایی بەهایە، چونکە ژیانی یاخیبوویی لە ڕوخاندن و دامەزراندنێکی بەردەوام دایە.

ئێمە باسی دوو شێوازی یاخیبوونمان کرد، لە هەردوو شێوازەکەدا داهێنان دەبێت بە پردی پەیوەندی نێوان بوون و مێژوو. لە سەرەتاوە هەردوو شێوازەکە؛ یاخیبوونی ئۆنتۆلۆجی‌و یاخیبوونی مێژوویی، فینۆمینۆلۆجیانە، وەکو دوو شێوازی جیاواز دەردەکەون. بەڵام لە لێکدانەوەی ئۆنتۆلۆجیانەدا هەردووکیان پێکەوە دەبن بە تەواوکەری یەکدی. هەردووکیان لەو خاڵە هاوبەشەدا یەکدەگرن، کە یاخیبوون بە ڕەتدانەوەی دەسەڵاتی داگیرکەر دادەنێت. ناگونجێ یاخیبوویەکی ئۆنتۆلۆجی لەگەڵ هەڵبژاردنی بێ‌باوەڕگەریدا داگیرکراوی مێژوویی بێت و یاخیبوویەکی مێژوویش خۆی بە کۆیلەی دەسەڵاتێکی دەرەکی

ئۆنتۆلۆجی دابنێ. یاخیبوونی ناو مێژوو لەوێدا تەواو دەبێت، کە بەرهەڵستی هەموو دەسەڵاتێکی دەرەکی- داگیرکەرانە دەکات و دژی ڕادەوەستێ. لەم بەر هەڵستیەدا دەسەڵاتی (داهێنان) بۆ ئاگامەندی دەگێڕێتەوە. ئاگامەندیش سەربەستانە بەو دەسەڵاتەوە ڕوو لە داهاتوو دەکات و مێژووی خۆی تۆمار دەکات. یاخیبوون داهێنانی مێژووەو سەڵماندنی ڕەسەنیەتی بوونەو واتا بە بوون دەبەخشێ. مرۆڤ هەیە، بۆیە دەبێ یاخی بێت.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوەکان بە کوردی


- شێرکۆ بێکەس، دەربەندی پەپوولە، ستۆکهۆڵم، 1990.
- نالی، دیوانی نالی، لێکدانەوەی مەلاعەبدولکەریمی مودەرس و فاتح عەبدول کەریم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1976.
- فەرهاد شاکەلی، نیگاری تۆ لە دیواری زیندانەکەم هەڵدەکۆڵم، ستۆکهۆڵم، 1994.
- ڕەفیق سابیر، ڕێژنە، پەڕتوکخانەی سیدیان، مەهاباد، 1979.
- محەمەد کەمال، ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتیو بوونی مرۆڤ، دەزگای هەوار، ئەدلاید، 2001.

## سەرچاوەكان بە عەرەبی


- الطبري، تآريخ الأمم و الملوك، دارالكتب، بيروت، 1975.
- الدكتور محمد على آبوريان، تأريخ الفكر الفلسفي في الاسلام، دار النهظة العربية، بيروت، 1973.
- هنري، كوربان، تاريخ الفلسفة الاسلامية، راجعەو قدم له الامام موسى الصدر، عويدات للنشرو الطباعة، بيروت، 1998.
- ابن سينا، الاشارات و التنبيهات، القاهرة، 1960.
- ابن سينا، النجاة، القاهرة، 1960.
- صدرالدين شيرازى، الاسفار الأربعه، المجلدالأول، تحقيق محمد حسين طباطبائي، دائرة المعارف الاسلامية، 1985.

## سەرچاوەکان بە ئینگلیزی

Ackrill, J. L. (ed.). *A New Aristotle Reader*, Oxford: Clarendon Press, 1987.

Albert, Michael & Hahnel Robin. *Unorthodox Marxism*, Boston: South End Press, 1978.

Allison, Henry E. *Kant's Transcendental Idealism: An Interpretation and Defence*, New Haven: Yale University Press, 1983.

Aristotle. *Metaphysics* translated by W. D. Ross and F. H. Robes, Oxford: Clarendon Press, 1929.

………… *Physics*, translated by W. D. Ross and F. H. Robes, Oxford: Clarendon Press, 1929.

………… *Posterior Analytica,* translated by W. D. Ross and F. H. Robes, Oxford: Clarendon Press, 1929.

Audi, Robert. *The Cambridge Dictionary of Philosophy*, Cambridge University Press, 1997.

Ayer, A. J. *Language, Truth and Logic*, London: Gollancz, 1967.

………….. *The British Empiricists*, Oxford: Oxford University Press, 1992.

Barnes, Jonathan. *Aristotle*, Oxford: Oxford University Press, 1986.

Beamish, Rob. *Marx, Method, and the Division of Labor*, University of Illinois Press, 1992.

Nennett, Jonathan, *Kant's Analytic*, Cambridge: Cambridge University Press, 1966.

Bergson, Henri. *Time and Free Will*, translated by F. L. Pogson, London: Mammalian, 1940.

……………*An Introduction to Metaphysics*, translated by T. Hulme, New York: Liberal Arts, 1949.
Bush, Thomas W. *The Power of Consciousness and the Force of Circumstances in Sartre's Philosophy*, Indiana University Press, 1990.
Cahoon, Lawrence (ed.). *From Modernism to Postmodernism*, London: Blackwell, 1996.
Charlesworth, Max. *The Existentialists and Jean-Paul Sartre*, Brisbane: The University of Queensland Press, 1975.
Chittick, William. *Ibn al-Arabi's Metaphysics of Imagination: The Sufi Path of Knowledge*, New York: State University of New York Press, 1989.
Clarke, Simon. *The Foundations of Structuralism: A Critique of Levi Strauss and the Structuralist Movement*, the Harvester Press, 1981.
Cooper David, E. *World Philosophies: An Historical Introduction*, second edition, London: Blackwell, 1999.
Copleston, Frederick. *A History of Philosophy*. (9 Volumes) New York: Image Books. 1993

Culler, Johathan. *On Deconstruction: Theory and Criticism after Structuralism,* London: Routledge & Kegan Paul, 1983.
Curley, E. M. *Spinoza's metaphysics: An essay in Interpretation*, Cambridge: Harvard University Press, 1969.
Derrida, Jacques. "The End of the Book and the Beginning of Writing", in *Modernism to Postmodernism: An Anthology*, London: Blackwell, 1996.
……………*Margins of Philosophy*, translated by Alan Bass, Chicago: The University of Chicago Press, 1982.

Descartes, Rene. *Philosophical Writings*, Elizabeth Anscombe (ed.), Nelson's University Papaerback, 1970.

Descombes, Vincent. *Modern French Philosophy*, translated by l. Schott-Fox, and J. M. Harding, New York: Cambridge University Press, 1980.

Dilthey. W. "The Development of Hermeneutics'. in *W. Dilthey: Selected Writings*, H. P. Rickman (ed.), Cambridge University Press, 1976.

Dorter, Kenneth. *Form and Good in Plato's Eleatic Dialogues*, University of California Press, 1994.

Dostoyevsky, Fyodor. *The Devils*, translated by David Magarshack, London: Penguin Books, 1975.

Dreyfus, Hubert. *Being-in-the-World: A Commentary on Heidegger's Being and Time, Division 1*, The MIT Press, 1991.

Edwards, Paul (ed.). *The Encyclopedia of Phi*losophy, 8 Volumes, New York: Macmillan Publishing Co., 1972.

Gadamer, Hans-George. *Truth and Method*, translated by William Glen-Doepel, London: Sheed and Ward, 1979.

Gay Peter (ed.). *The Enlightenment, A Comprehensive Anthology*, New York: Simon & Schuster, 1973.

Guthrie, W. K. C. *The Greek Philosophers from Thales to Aristotle,* London: Methuen & Co., 1967.

Harvey, David. *The Condition of Postmodernity*, London: Blackwell, 1990.

Hegel, G. F. W. *Encyclopedia of Philosophical Sciences*, translated by William Wallace, London: Oxford University Press, 1985.

…………….. *The Phenomenology of Mind*, translated by J. B. Baillie, New York: Harper Torchbook, 1967.

Heidegger, Martin. “Letter on Humanism”, in *Basic Writings*, David Farrel Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

……………..“On the Essence of Truth”, in *Basic Writings*, David Farrel Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

……………..“The Question Concerning Technology”, in *Basic Writings*, David Farrel Krell (ed.), London: Routledge, 1996.

…………….. *Being and Time*, translated by John Macquarrie & Edward Robinson, London: Blakwell, 1997.

…………….. *Introduction to Metaphysics*, translated by Ralph Mannheim, Yale University Press, 1959.

Herodotus. *History of the Greco-Persian War*, London: Bell, 1875.

Hume, David. *A Treatise of Human Nature*, second edition, Oxford: At the Clarendon Press, 1985.

Husserl, Edmund, *Ideas: General Introduction to Pure Phenomenology,* translated by W. R. Boyce Gibson, London: George Allen and Unwin, 1931.

……………. *The Shorter Logical Investigations*, translated by J.N. Findlay, London: Routledge, 2001.

Ibn Rushd. *Tahafut al-Tahafut*, translated by S. Van den Bergh, London: Luzac, 1978.

Ibn Sina. *On Theology*, translated by Arthur J. Arberry, London: 1951.

Kant, Immanuel. *Critique of Pure Reason*, translated by F, Max Muller, New York: The Anchor Books, 1966.

Kaufman, Walter. *Existentialism From Dostoevsky to Sartre*, New York: New American Library, 1975.

……………*Nietzsche: Philosopher, Psychologist, Antichrist*, Princeton: Princeton University Press, 1974.

Kenny Anthony. *Descartes: A Study of His Philosophy*, New York: random House, 1968.

Kockelmans, Joseph J. *On the Truth of Being: Reflections on Heidegger's Later Philosophy*, Bloomington: Indiana University Press, 1984.

Kruks, Sonia. *Situation and Human Existence: Freedom, Subjectivity and Society*, London: Unwin Hyman, 1990.

Leaman, Oliver. *An Introduction to Classical Islamic Philosophy*, Cambridge: Cambridge University Press, 2002.

Longenecker, Richard, N. *Biblical Exegesis in the Apostolic Period*, Eerdmans, 1975.

Makkrell, A. Rudolf. *Dilthey: Philosophy of the Human Studies*, Princeton University Press, 1975.

Marx, Karl. "Thesis on Feuerbach", *The Portable Karl Marx*, Eugene Kamenka (ed.), New York: Penguin Books, 1993.

……………..*Capital*, Moscow: Progress Publisher, 1974.

……………. *Economic and Philosophical Manuscript 1844*, Moscow: Foreign Language Publishing House, 1956.

……………. *Selected Works*, (3 Vols) London: Lawrence & Wishart, 1975.

Merleau-Ponty, M. *The Primacy of Perception*, Northwstern University Press, 1964.

Moran, Dermot. *Introduction to Phenomenology*, London: Routledge, 2000.

Mulla Sadra. *Al-Asfar al-Arba'ah*, 9 Vols, Teheran. 1958.

---------------. *Al-Hikma al-'Arshiyyah*, translated by James W. Morris, New Jersy: Princeton University Press, 1982.

---------------. *Al-Masha'ir*, translated by Parviz Moreledge, New York: Institute of Cultural Global Studies, 1992.

Mure, G. R. G. *Aristotle*, Westport, Conn: Greenwood Press, 1975.

Nasr, Seyyed Hossein and Leaman, Oliver (ed.). *History of Islamic Philosophy*. London: Routledge. 1996.

Nietzsche, F. *Thus Spake Zarathustra*, translated by Nicholas Davey, Wordworth Classics, 1997.

……………. *The Genealogy of Morals*, translated by Francis Gollfing, New York: Anchor Books, 1990

Odajnyk, Walter. *Marxism and Existentialism*, New York: Anchor Books, 1965.

Okrent, Mark. *Heidegger's Pragmatism. Understanding, Being, and the Critique of Metaphysics*. Cornell University Press, 1988.

Ollman, Bertell. *Alienation: Marx's Conception of Man in Capitalist Society*, Cambridge University Press, 1971.

Pearson, Keith Ansell and Mullarkey John (ed.). *Henri Bergson: Key Writings*, London: Continuum, 2002.

Plato. "The Republic", *The Portable Plato*, Scott Buchanan (ed.), New York: The Viking Press, 1978.

Randall, John Herman. *Aristotle*, New York: Columbia University Press, 1960.

Riceour, Paul. *The Conflict of Interpretation: Essays in hermeneutic*. Don Ihde (ed.), Northwestern University Press, 1974.

Richardson, John. *Existential Epistemology: A Heideggerian Critique of the Cartesian Project*, Oxford: Clarendon Press, 1991.

Richardson, William J. *Heidegger: Through Phenomenology to Thought*. Den Haag: Martinus Nijhoff, 1963.

Rizvi, Sayid Athar Abbas. *Shah Wali-Allah and His Times*, Canberra: Ma'rifat Publishing House, 1980.

Ross, W.D. *Aristotle*, London: Methuen & Co., 1937.
Ryle, Gilbert. *The Concept of Mind*, New York: Penguin Books, 1980.
Santoni, Ronald E. *Bad Faith, Good Faith and Authenticity in Sartre's Early Philosophy*, Temple University Press, 1995.
Sartre, Jean-Paul *Being and Nothingness*, translated by Hazel E, Barnes, London: Routledge, 1996.
……………. *Critique of Dialectical Reason*, translated by Alan Sheridan-Smith, London: NLB, 1976.
……………. *The Flies*, translated by Stuart Gilbert, London: Hamish Hamilton, 1978.
…………….. *Search for a Method*, translated by Hazel E, Barnes, New York: Random House, 1958.
……………. *The Transcendence of the Ego*, translated by Forrest Williams and Robert Kirkpatrick, New York: Hill and Wang, 1995.
Scott, A. F. *Current Literary Terms*, London: The Macmillan Press, 1979.
Sharif, M. M. *A History of Muslim Philosophy*, Two Volumes, Wiesbaden: Otto Harrassowitz, 1963.
Sheridan, James. *Sartre the Radical Conversion*, Ohio: Ohio University Press, 1969.
Silverman, Hugh J. *Inscriptions After Phenomenology and Structuralism*, Northwestern University Press, 1997.
Sirhindi, Shaykh Ahmed. *Maktubat*, Lahore: Nur Co., 1964.
Spinoza. *Ethics*, translated by Andrew Boyle, London: Everyman's Library, 1970.
Stenzel, Julius. *Plato's Method of Dialectic*, translated and edited by D. J. Allan, New York: Arno Press, 1973.
Strawson, P. F. *The Bounds of Sense: An Essay on Kant's Critique of Pure Reason*, London: Methuen, 1966.

Taylor, Charles. *Hegel*, Cambridge: Cambridge University Press, 1975.
Warnock, G. J. *Contemporary Moral Philosophy*, London: Macmillan, 1967.

# فەرهەنگۆك

| | |
|---|---|
| **ئەپستمۆلۆجی** | زاراوەیەکی یۆنانیەو ئەو بەشەی فەلسەفەیە لە چیەتی زانین دەکۆڵێتەوە. |
| **ئەنەلۆجی** | شوبهاندن |
| **ئەستو** | ماتەر Matter |
| **ئەستویی** | ماتەری |
| **ئەندێشە** | ڕامان، خەیاڵ، Imagination |
| **ئامێر** | ئامراز، کەلوپەلی بەردەست. |
| **ئیشراقی** | جۆرێك لە بیرکردنەوەی فەلسەفیانەیە شەهابەدین سوهرەوەردی (1153-1192) کە بە (المقتول) ناسراوە هێناوییەتە کایەوە. |

| | |
|---|---|
| **ئاگامەندی ڕەها** | ئاگامەندی بێسنوور و هەمەکی. |
| **بابەت** | Object |
| **بار** | کاتیگۆری. دەخرێتە پاڵ بارهەڵگر. بۆ نموونە (سوکرات فەیلەسوفە) لێرەدا سوکرات بارهەڵگرەو فەیلەسوفیش بارە. |
| **بارهەڵگر** | ناوەڕۆك لە لۆجیکی ئەریستۆدا، کە بە ڕێگەی بارەکەیەوە باشتر دەناسرێت. |
| **بوون** | بوونی گشتگر، بنەڕەتی هەموو شتێکی هەبوو، بوونێك کە بوونی هەموو شتێکی لەسەر ڕاوەستاوەو خۆی پێویستی بە چی دیکە بۆ بوونی نیە. |

| | |
|---|---|
| **بوون- لەناو- جیهان** | پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤەو لە هەموو پێشمەرجەکانی دیکە هەمەکی و لە پێشترە. |
| **بوون- لەناو- شوێن** | ێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤەو لە بوون لە ناو جیهانەوە پەیدا دەبێت. |
| **بوون- لەگەڵ** | ێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤەو ئاماژەی پەیوەندییەکانی (من)و(کەسانی دیکە)دەکات. |
| **بوونی دیاردە** | بنەڕەتی دیاردە یان ئەو بناخەیەی دیاردەکەی لەسەر دامەزراوە. |
| **بوونی ڕەها** | بوونی بێسنورو تەواوکۆو خۆبژێو. |
| **بێ بڕوا** | ڕەتدانەوەی بوونی سەدەمی یەکەم بۆ جیهان و بوونی مرۆڤ. |
| **بیردۆزە** | تیوری، دیمانە. |

**بیری زگماکی** جۆرێکە لە بیرۆکە یان زانین بە دیدی دێکارت مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتە جیهانەوەو سەدەمی هۆشەکی لە ناو هۆشی مرۆڤدا دایناوە.

**بێهودە** بێ کەڵك و لە واتابەدەر.

**بنەڕەتی لە بنەڕەت بەدەر** مەبەست بوونی گشتگرە، کە دەبێت بە بنەڕەتی هەموو شتێك و خۆی پێویستی بە بنەڕەت نیە.

**بەڵگەنەویست** دیاردەیەك هێندە ئاشکرابێت پێویستی بە بەڵگەو سەلماندنی بۆ بوونی نەوێت.

**پارادۆکس** کێشەیەك ڕەتدانەوەی مەحاڵ بێت. بۆ نموونە ناتوانین بڵێین لاکێشە خڕە.

**پەیوەندی پێویست** پەیوەندییەکی دیالێکتیکی‌یە لە نێوان دوو هەبووی جیاوازدا، وەکو هۆو ئاکام.

**پەیوەندی دیالێکتیکی** پەیوەندی نێوان بابەت و دژە بابەت، لە ڕاوەستانیان بەرانبەری یەکدی بەبێ یەکدی نابن. پەیوەندییەکی پێویست، کە نەتوانین بە پێچەوانەوە بیری لێبکەینەوە.

**پەیوەندی ناوەکی** پەیوەندییەك لە دەرەوە دانەمەزرێ.

**پێشتر** شتێك یان هۆکارێك پێش بوونی ئێمە بکەوێت، یان لە پێش ئەزموونی هەستەکیمانەوە سەری هەڵدابێت و پێویستی بەو ئەزموونە نەبێت.

**پێشمەرجی ئەپستمۆلۆجی** ئەو پێشمەرجە پێویستانەن، کە بەبێ ئەوان زانین پەیدا ناکرێت.

**تازەگەری** بەو قۆناخە فەلسەفیە دادەنرێت لەگەڵ بۆچوونەکانی ڕێنە دێکارت(1596-1650) دەستپێدەکات.

| | |
| --- | --- |
| تیۆ- ئۆنتۆلۆجی | Theo-ontology ئۆنتۆلۆجیەك خۆی لەسەر بناخەی بوونی سەدەمێکی هۆشەکی و (غایە)دەر بە بوون دادەمەزرێنێ. |
| ترانسێندنتاڵ | بەرز، لە ژوور ئاگامەندییەوە. |
| ترس | هەستکردنە بە لاوازیو بێدەسەڵاتی لە ئاستی هێزێکی هەڕەشەکەردا. |
| جیهانگەری | بوون — لەناو جیهاندا. شێوازێکی تێگەیشتنە لە پێشمەرجی بوون- لەناو جیهاندا. |
| جیهانی ئایدیاڵ | جیهانی فۆرمە هەمەکیەکانی مێتافیزیکی ئەفلاتون. |
| جیهانی دەرەکی | جیهانی دەرەوەی بیرکردنەوە، داکەوت. |
| جیهانی ناوەوە | مەبەست لە جیهانی بیرکردنەوە و ئەندێشەیە، نەك ناوەڕۆکێکی گیانەکی. |

| | |
|---|---|
| **حەدەس** | دەرككردنی ڕاستەوخۆ بە بابەتی دەرەوەی ئاگامەندی. |
| **خۆ** | زات- Subject |
| **خۆی بەرز** | خۆیەك لەژوور ئەزموونە هەستەكیەكانەوە یەكێتی لە نێوانیان دروست دەكات. خۆیەكە بە ڕێگەی ئەزموونی هەستەكیەوە ناناسرێت. |
| **خۆپێزی** | خۆ- خۆیی. |
| **دابڕانی سەرمەدی** | مردن، لەناوچوونێكی هەمیشەیی‌و بێگەڕانەوە. |
| **دازاین** | زاراوەیەكی ئەڵمانیە Dasein واتە بوون- لێرە. مارتن هایدیگەر بۆ بوونی مرۆڤ بەكاریهێناوە. |
| **داهێنان** | پەلكێشكردنی بوونێك لە نەبوونەوە. |

| | |
|---|---|
| **دەرچوون** | بیرکردنەوەیەکی مێتافیزیکیە ئەفلوتین لە فەلسەفەی ڕۆژئاوادا بە دانەری دادەنرێت. بە گوێرەی دەرچوون خوا جیهانی ئافەرید نەکردووە، بەڵکو، وەکو چۆن تیشك و ڕووناکی لە خۆرەوە دەردەچن، جیهانیش لە خواوە دەرچووە. |
| **داهێنان** | ئافەریدکردنی بوونێك لە نەبوونەوە. |
| **دووەلیست** | بۆچوونێکی مێتافیزیکییە باوەڕ بە بوونی دوو ڕاستەقینەی هاوتەراز دەهێنێت، کە هیچیان پێویستی بەوی دیکە بۆ بوونی نەبێت. |
| **دیاردەی بوون** | خۆ دەرخستنی (بوون) لە شێوازێکدا. |
| **دیالێکتیك** | زاراوەیەکی یۆنانیە بۆ یەکەمجار زینۆیئیلیاو سوکرات و ئەفلاتون بەکاریانهێناوە. هیگڵ و مارکس بەرەوپێشەوەیان بردووەو، وەکو، شێوە لۆجیك داکەوت و گۆڕانکارییەکانی نێو داکەوتیان لە سەر ڕاڤە کردووە. |

**ڕەتدانەوە** (نەفی)کردن. هێزی دیالێکتیکیەو گۆڕانکارییەکان ئافەرید دەکات.

**ڕەسەن** بوونێکی خۆناس و خاوەن خۆ.

**ڕادیکاڵ** بنەڕەت، بناخە، بنەما.

**ڕاستی بەرز** ڕاستی ترانسێندنتاڵ. ڕاستیەك لەژوور ئەزموونی هەستەکییەوە.

**ڕاستی ڕەها** ڕاستیەکی هەرگیز نەگۆڕ.

**ڕسکاو** لەخۆوە پەیدا بوو، ئافەرید نەکراو.

**ڕووداو** لە لۆجیکی ئەریستۆدا خسڵەتێکی ناوەڕۆکە، کە ناوەڕۆك دەتوانێت بەبێ ئەو بمێنێتەوەو بوونی بەردەوام بێت. مرۆڤی پێست ڕەش هەیە. بەڵام

| | |
|---|---|
| | پێست ڕەشی ڕووداوە، ئەگەر مرۆڤ پێستی ڕەشیش نەبێت هێشتا مرۆڤە. |
| **ڕووداوگەری** | بۆچوونێکی مێتافیزیکییە بنەڕەتی پێویست بۆ ڕووداوەکان ڕەت دەداتەوە. |
| **ڕێکەوت** | بێ مەبەست |
| **زانینی هەستەکی** | زانینێك بە ڕێگەی هەستکردنەوە پەیدا دەبێت. |
| **زانینی هۆشەکی** | زانینێك بە ڕێگای هۆشەوە پەیدا دەبێت و هەمەکییە. |
| **زوروان** | کاتێکی تایبەتە بۆ ئاگامەندی. بەردەوامییە لە بیرکردنەوەدا. |
| **سەدەمی هۆشەکی** | سەدەمی یەکەم لە فەلسەفەی ئەریستۆدا. |

**سەدەمی یەکەم** هۆکار یان بنۆسی یەکەم. لە فەلسەفەی ئەریستۆدا ئەو بوونەیە، کە لەوەوە جوڵان و گۆڕانکارییەکان لە بووندا دەکەونە گەڕ بەڵام خۆی جوڵان و گۆڕانکاری تێدا ڕوونادات.

**سەرمەدی** هەمیشەیی.

**سپارتاکۆس** (71پ ز مردووە) کۆیلەیەکی سەدەمی ڕۆمان. دژی کۆیلایەتی ڕاوەستاوەو ژمارەیەکی زۆر لە کۆیلەکان شوێنی کەوتوون. لە ساڵی 71ی پێش زایین دا سپارتاکۆس و هاوڕێکانی گیران و لە خاچدران.

**سوپەرمان** مرۆڤی بەرز، ئامانجی مرۆڤە لە فەلسەفەی نیتشەدا.

**شت** یەکگرتنی فۆرم و ناوەڕۆك.

**شیکردنەوە** وردکردنەوەی واتای چەمکێك بۆ لایەنەکانی.

| | |
|---|---|
| **عیرفان** | زانینی سوفیگەرانە بۆ ناسینی ڕاستی (حەقیقەت). |
| **فۆرم** | شێوە |
| **فینۆمینە** | دیارە، خۆدەرخستنی بوون. ئەو لایەنەی بوونە خۆی دەخاتە بەر ڕۆشنایی زانین. |
| **فینۆمینۆلۆجی** | دیاردەگەری. ئەو میتۆدە فەلسەفیەیە ئەدمۆند هۆسرڵ بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر واتای دیاردەی بوون دایمەزراند. |
| **کاتیگۆرییەکان** | ئەو مەقولاتانەیە ئەریستۆ بە بار بۆ ناوەڕۆك یان بارهەڵگر داینناون. |
| **کارەکی** | پڕاکتیك سەقامگیرکردنی بیردۆزە بۆ پێکهێنانی گۆڕانکارییەکان. |

**کۆتایی مێژوو** گەیشتن بە دوا قۆناخی پێشکەوتن لە مێژوودا. بۆچوونێکی هیگڵیانەیەو مارکسیانەیە. بەدیدی ئەم دوو فەیلەسوفە مێژوو لەئەنجامی گۆڕانکارییە دیالێکتیکەکەدا دەگاتە قۆناخێك، کە هەموو ناکۆکیەکانی تێدا وون دەبیٚو لەوە زیاتر پێشناکەوێت.

**کۆجیتۆ** گوتە بەڵگەنەویستەکەی دێکارت(من بیردەکەمەوە کەوابوو من هەم.)

**گەڕانەوەی سەرمەدی** بیروباوەڕێکە لای نیتشە، گوایە ژیان لە سوڕانەوەیەکی سەرمەدی بازنەییدایەو تاکەکان جارێکی دیکە دوای مردن دەگەڕێنەوە بۆ جیهان. ئەمەش بیروباوەڕێکی کۆنەو لەلای هەندێ فەیلەسوفی یۆناندا، وەکو پایتاگۆراس پەیڕەوی کراوەو لە (سمسارا)ی ناو فەلسەفەو ئاینی هیندووسیشەوە نزیکە.

**گومانکاری** گومانایەتی، دڵنیا نەبوون لە ڕاستی.

**گونجاو** پەیدابوو یان پەیدا کراو، داهێنراو. بۆ نموونە پڕۆژەکانی بوون گونجاون.

**گۆڕانی ڕادیکاڵ** گۆڕانی بنەڕەتی.

**مردن** پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ. کۆتایی هەموو پڕۆژەکانی بوونە

**مێتافیزێك** زاراوەیەکی یۆنانیە واتای ژوور- سروشت دەبەخشێ. ئەو بەشەیە لەفەلسەفەدا لە بوونێك دەکۆڵێتەوە لە ژوور سروشتەوە یان جیهانەوە خۆی ڕاگرتووە.

**نەبوون** هیچ

**ناڕەسەن** بوونێکی خۆنەناس و نامۆ، بوونێکی داگیرکراو.

**نازانمکاری** فێرگەیەکی مێتافیزیکییەو بانگەشەی نەزانینی ڕاستییە دوورەکانی بوون دەکات.

**ناچارەیی یان ناچارەکی** ڕاڕەوێکی مێتافێزیکیو ئاکارییە ڕووداوەکان یان گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو بە دەسەڵاتێکی دەرەکییەوە بێجگە لە دەسەڵاتی مرۆڤ دەبەستێتەوە.

**ناوەڕۆکی گیانەکی** ناوەڕۆکێکی لە ئەستو بەدەرە لە فەلسەفەی دێکارتدا سەرچاوەو بنەڕەتی (خۆ)ی مرۆڤە. ناوەڕۆکی گیانەکی بەگوێرەی بۆچوونەکانی دێکارت خۆیەکی سەربەخۆو خۆبژێوو نەگۆڕە.

**ناوەڕۆکی پێدراو** ناوەڕۆکێك مرۆڤ خۆی داینەهێنابێت.

**نامۆیی** ناڕەسەنی، بوونێکی داگیرکراو، خۆ نە ناس.

**ناماقوڵ** بێ بناخە، بێ مەبەست، شتێك هۆش نەیسەلمێنێ.

| | |
|---|---|
| **نۆمینە** | بوون- لەناو- خۆی. جۆرێك بوونە بە بیروڕای کانت لەژوور بوونی ئێمەوەیەو سەرچاوەی هەموو شتێکە. |
| **هەندەکی** | Particular |
| **هەمەکی** | Universal |
| **هەبوو** | هەیەی بوونێکی پڕو خاوە چیەتیەکی نەگۆڕ. |
| **هۆ** | سەدەم |
| **هیچگەری** | نیهێلیزم. جۆرێکە لە بۆچوونی مێتافیزیکی لەگەڵ ڕەتدانەوەی بوونی سەدەمی یەکەمدا سەرهەڵدەدات. هیچگەری فرەجۆرەو واتاکەشی لە نیتشەوە بۆ هایدیگەر دەگۆڕێت. |

**یاخیبوونی ئۆنتۆلۆجی** ڕەتدانەوەی بوون و دەسەڵاتێکی سەدەمی هۆشەکی لە ژوور دەسەڵات و بوونی مرۆڤەوە. بێ بڕوایی، بێبڕواگەری.

**یاخیبوونی مێژوویی** ڕەتدانەوەی هەموو دەسەڵاتێکی دەرەکی ناومێژوو، کە بوونی مرۆڤ داگیر دەکەن.

**یەکانەگی** بۆچوونێکی مێتافیزیکییە باوەڕ بە بوونی یەك جۆر ڕاستەقینە دەهێنێت.

# ئیندێکس

## ئ

# ح







# د

# س





# ف



# ق

# ک









# م





## و





# ی

# Being and Creativity

**Dr Muhammad Kamal**

د. محەمەد کەمال ساڵی 1955 لە شاری کەرکوک لە دایکبوە. خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی بازرگانی لە شاری سلێمانی تەواوکردووە. پاش تەواوکردنی ئامۆژگای مامۆستایان لە هەولێر ساڵێک لە هەڵەبجەو دوو ساڵ لە گوندی ئاوەکەڵە مامۆستا بووە.
لە ساڵی 1979 بۆ خوێندن ڕووی لە هەندەران کردوە، لە زانکۆی کەراچی ماجستێرو دکتۆراکەی لەسەر لۆجیکی دیالێکتیکی هیگڵ لە ساڵی 1988 تەواو کردوە و لەو زانکۆیەش لە بەشی فەلسەفە دەکرێت بە مامۆستا. لە ساڵی 1993 بۆ توێژینەوەی پاش دکتۆرا لەسەر (من و کەسانی دیکە لە فەلسەفەی هیگڵ و هیدیگەردا) چووە بۆ ئاڵمانیا.
لە ساڵی 1994 بەرەو ئوستراليا کۆچی کردوەو ئێستا لە زانکۆی ماڵبۆرن مامۆستایە.
د. محەمەد کەمال چوار پەڕتووکی لە سەر فەلسەفە بە ئینگلیزیو پێنج پەڕتووکیشی بە کوردی بڵاوکردۆتەوەو نزیکەی چل لێکۆڵینەوەشی بە ئینگلیزی لەمەر کێشە فەلسەفیەکان لە گۆڤارە فەلسەفیەکاندا بڵاوکردۆتەوە.
پەڕتووکەکانی بە کوردی ئەمانەن:

- ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی و بوونی مرۆڤ (2001)
- فەلسەفەی هیگڵ (2001)
- کێشەی بوون لە مێژووی فەلسەفەدا (2002)
- فەلسەفەی سارتەرو خوێندنەوەیەکی نوێ (2003)